# نەوژین

ژمارە (١٧) دوشەمە ٢٠١٨/٤/٢٣

مانگنامەیەکی تایبەتە بە پرسەکانی ژنان، رادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی NED ئەمریکی لەگەرمیان دەریدەکات




شەیما مەحمود:
شانۆ ژیانە

7««

# ژنانی گەرمیان کۆتایی بە «قۆرخکاریی پیاوان بۆ سیاسەت» دەهێنن



■ نەوژین

**بەشێکی بەرچاو لە ژنانی گەرمیان رو لە کایەی سیاسەت دا دەکەن و بەمەش خەریکە کۆتایی بەو قۆرخکارییە دێنن کە لە بواری سیاسەت دا بۆ پیاوان هەیە، هەروەک ژمارەیەکی بەرچاو لە ژنان خۆیان لەسەر لیستە جیاوازەکان بۆ هەڵبژاردنی ئەمجارە پاڵاوتوە.**

بەپێی راپۆرتێکی ئەم ژمارەیەی رۆژنامەی نەوژین کە لە لاپەڕە (٢) دا بڵاوکراوەتەوە، زیاتر لە پێشو، ژنانی گەرمیان رویان لەکایەی سیاسیی و کارکردن لەو بوارەدا کردوە.

بەپێی راپۆرتەکە، لەئێستادا بەشێکی بەرچاو لە حیزب و لایەنە سیاسیەکانی هەرێم لە گەرمیان، کادیری ژن لە پێکهاتەی دا هەن، هەروەک بەشێکی تر لە ژنان لەم نزیکانەدا پەیوەندیان بە رێکخستنە حزبیەکان کردوە.

لەوبارەوە، فرمێسک عوسمان، ئەندامی ئەنجومەنی گشتی هاوپەیمانیی بۆ دیموکراسیی و دادپەروەریی لە گەرمیان، بۆ (نەوژین)ی وتوە: «بەشداریی ژن لە سیاسەتدا گرنگە، چونکە ژن نیوەی کۆمەڵگە پێکدێنێت».

لایخۆشیەوە، شەیما جەمال، ئەندامی دەستەی کارگێڕی مەکۆی بزوتنەوەی گۆڕان لەکەلار، بۆ (نەوژین) ئاماژەی بەوەداوە «هەر ئەو پیاوانەی لە لوتکەی دەسەڵاتن و مافەکانی ژنان پێشێل دەکەن، لەلایەن ئێمەی ژنانەوە گەورەکراون و بەخێوکراون، بۆیە گرنگە ژنان خۆیان مافەکانیان وەرگرنەوە».

هەروەک ئاوات ئەحمەد، کارگێڕی ناوچەی پارتیی لەکەلار، دەڵێت: «دەمەوێت لە رێگەی ئەو پلە حیزبییەی کە هەمە، لە رێگەی تواناکەمەوە بەرزتری بکەمەوە و بچمە پێشەوە».

لەلایەکی دیکەوە بۆ هەڵبژاردنی ئەمجارەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، ژمارەیەک لە لیستەکان کاندیدای ژنیان لە سنوری گەرمیاندا هەیە، لەوانەش لیستەکانی: (نەوەی نوێ، یەکێتی نیشتمانی، ئازادیی).



ژنانی رزگاربوی ئەنفال هەم دایک بون و هەم باوک

4««

## بۆچی کوڕان و کچان لە قوتابخانە جیا دەکرێنەوە؟



3««



لەکەلار دو خوشک پێکەوە نانەواخانەیەک بەرێوەدەبەن

5««

## کارگوزارەکان... فریشتەکانی خاوێنکردنەوەی قوتابخانە



6««



ئایا شیری قوتو دەبێتە شوێنگرەوەی شیری دایک؟

10««

# «سیاسەت تەنیا بۆ پیاوان» کۆتایی هات



■ نەوژین، نیگار عومەر

**ئەگەرچی پێشتر سیاسەت بەکاری پیاوان دەزانرا و دادەنرا، بەڵام وادیارە ژنانی گەرمیان دەیانەوێت بە چالاکیی بەشدارییان لەم کایەدا، ئەو بەرگە لەبەری سیاسەت دابکەنن.**

بەردەوام لەگەرمیان زیاتر لەناوچەکانی تر، بەشداریی ژنان لەکایەی سیاسیی دا لاواز بوە، بەڵام ئەم واقیعە خەریکە سەرەتاکانی گۆڕینی بەدیار دەکەوێت، بەتایبەتی کە ژمارەیەک لە ژنان لە رێگەی حیزبەکانەوە هاتونەتە نێو بواری سیاسەت.

فرمێسک عوسمان، ئەندامی ئەنجومەنی گشتی هاوپەیمانیی بۆ دیموکراسیی و دادپەروەریی لە گەرمیان، بۆ (نەوژین) باس لەوە دەکات کە بۆچی بەشداریی سیاسەتی کردوە؟

دەڵێت: «بەشداریی ژن لە سیاسەتدا گرنگە، چونکە ژن نیوەی کۆمەڵگە پێکدێنێت».

فرمێسک لە درێژەی لێدوانەکەیدا، وتی: «پێویستە ژنان، شانبەشانی پیاوان، تواناکانی خۆیان پیشانبدەن لە بڕیارداندا»

وتیشی: «ژنان کە خاوەنی بڕیاری خۆیان بن، دەتوانن مافەکانی خۆیان بەدەست بهێنن».

بەشێک لە ئافرەتانی گەرمیان، باسلەوەدەکەن کە سیاسەت حەز و خولیایەکی لەمێژینەیانە، هەربۆیە ئەگەر پێشوتر دەرفەتی ئەوەیان پێنەدرابێت، بەڵام ئێستا توانیویانە خۆیان لەو بوارەدا ببیننەوە.

> گرنگە ژنان خۆیان مافەکانیان وەرگرنەوە

شەیما جەمال، ئەندامی دەستەی کارگێڕی مەکۆی بزوتنەوەی گۆڕان لەکەلار، بۆ (نەوژین) وتی: «سیاسەت حەز و خولیای منالّی من بوە، ئەمەش وای کردوە بێمە ناو ئەم کایەیەوە».

ئەو «هەڵسوڕاوەی» بزوتنەوەی گۆڕان ئاماژەی دا کە لە گەرمیان دا ئێستا رێژەی ژنان لەم کایەدا زیادی کردوە.

وتیشی: «ئەوەی گرنگە نابێت ژنان لە ماڵەوە دانیشن، چاوەڕوانی ئەوە بن کە مافەکانیان لە لایەن کەسانی ترەوە بەدەست بهێنرێت، بەڵکو دەبێت خۆمان تێبکۆشین و خۆمان مافەکانمان وەرگرینەوە».

ئاماژەی دا «هەر ئەو پیاوانەی لە لوتکەی دەسەڵاتن و مافەکانی ژنان پێشێل دەکەن، لەلایەن ئێمەی ژنانەوە گەورەکراون و بەخێوکراون، بۆیە گرنگە ژنان خۆیان مافەکانیان وەرگرنەوە».

زۆرجار بڕیارێکی پێشوەختە لە کۆمەڵگادا دراوە بەوەی حیزبەکان رێگە بە بونی ژنان لە نێویاندا نادەن و رۆڵیان قەتیس دەکەن، بەڵام کادیرێکی ئافرەتی پارتی دیموکرات، ئەم رایە رەد دەکاتەوە.

ئاوات ئەحمەد، کارگێڕی ناوچەی پارتیی لەکەلار، وتی: «لەناو حیزبەکەمدا ژن وەک پیاو خاوەن بڕیارە، بۆیە دەمەوێت لە رێگەی ئەو پلە حیزبییەی کە هەمە، لە رێگەی تواناکەمەوە بەرزتری بکەمەوە و بچمە پێشەوە».

ئاوات، ئاماژەی بەوەکرد کە دەبێت ژنان هەمو هەوڵێک بدەن لەوەی ئەو وێنەیە کاڵ ببێتەوە لە بیری خەڵکی دا بەوەی سیاسەت تەنها کاری پیاوە «لەهەر شوێنێک بم هەوڵ بۆ ژنان دەدەم، تا سیاسەت تەنها بەهی پیاوان نەزانن و بێنە پێشەوە».

شەیما جەمال-یش رایوایە بونی ژنان و رۆڵبینین و چالاکیان، وا لە ژنانی تر دەکات بێنە ناو سیاسەتەوە، ئەمەش سودی دەبێت بۆ ئەوەی ژنان پێکەوە «بگەنە ئامانجەکانیان».

ئەگەر کەسانێک هەبن کە پێیانوابێت بەشداریی ژنان لە سیاسەت دا مافە، ئەوا ئافرەتێکی سیاسەتوان وایدەبینێت کە ئەرکیشە.

بەهارە سەروەر، ئەندامی ئەنجومەنی کەلاری جوڵانەوەی نەوەی نوێ، بە (نەوژین)ی وت: «کاری سیاسەت و بڕیاردان لەسەر ئێستا و داهاتوی خۆمان، ئەرکی هەمو کەسێکە، ژنانیش بەشێکی ئەو ئەرکەیان لەسەرە».

ئەگەر هەمو حیزبێک ئەجێنداو بەرنامەو بەرژەوەندی سیاسیی خۆی هەبێت و هەوڵی پاراستن و بەدەستهێنانی بدات، ئەوا لەتەک ئەوەشدا ژنانی سیاسەتوان لەکەلار، وایدەبینن ئەرکەکەی ئەوان گشتگیر ترەو هەمو رەگەزی مێینە دەگرێتەوە.

لەوبارەوە (بەهارە سەروەر) وتی: «ئامانجم ئەوەیە، وەکو ژنێک بتوانم کاری باشتر بۆ ژنان بکەم».

---

# مامانی...

# نەخۆشخانە سەفەرییەکەی کوردەواریی بەرەو نەمان دەچێت

■ نەوژین، لەیلا ئەحمەد*

**پیشەی مامانی، یەکێک بو لە دیارترین ئەو پیشانەی کەلەرابردودا ژنانی گەرمیان وەکو کار و پیشە پێی هەستاون، بەڵام ئەم پیشەیە لەگەڵ هاتنە ئارای ناوەندی تەندروستی تایبەت بە لەدایکبون، وردە وردە بەرەو لەناوچون دەچێت.**

لەرابردودا بەهۆی نەبون و کەمی پزیشکەوە، زۆرینەی رەهای پرۆسەکانی منالّبونی ژنان، کەسانێک پێی هەڵدەستان کەبە «مامان» ناسراو بون، ئەوان بەپشت بەستن بە هەندێک بەهرەو ئەزمون، کاری لەدایکبونی منالانیان بەجێدەهێنا.

ئەم پیشەیە لەئێستادا لەلایەن حکومەت و وەزارەتی تەندروستییەوە قەتیسکراوە، ئێستا زۆرتر لەناو ئاوارەکان دا بونی هەیە، ئەمەش تاڕادەیەک نیگەرانی مامانەکانی لێکەوتوەتەوە.

مریەم رەحمان، ٥٢ساڵ، یەکێکە لەمامانەکانی گەرمیان، باسیلەوەکرد لەوکاتەی کە کەسی لەلا نەبوەو خۆی بوەتە مامانی خۆی، فێری پیشەکە بوەو دواتر مامانی بۆ سەدان ژن کردوە.

بەڵام ئێستا (مەریەم) وەکو جاران مۆڵەت و رێگەی پێنادرێت ئەو کارەی کە چەند ساڵێک دەیکرد، ئەنجامی بدات. لەوبارەوە وتی: «من ژنێکی نەخوێندەوارم و خولی مامانیم بینیوە، بەڵام باجم نییەو رێگە پێدراو نیم، چونکە کە ماڵمان لەگوند بو نەمدەتوانی خولەکان تەواو بکەم و باج وەر گرم».

لەگەڵ زیادبونی ژمارەی ژنانی پزیشکی پسپۆڕ لە ژنان و منالّبون، وردە وردە رۆڵی مامانەکان کاڵ بونەوە، تاوای لێهاتوە ئێستا بە دەگمەن ژنان بۆ منالّبون پشت بە مامان ببەستن.

> مامانێک: ئێستا وەک جاران ژنان روم تێناکەن

مەریەم، لەوبارەوە وتی: «ئێستا وەک جاران ژنان روم تێناکەن و قەناعەتیان پێمان نەماوە، بەڵام ژنی تر هەیە ئێمەی پێباشەو مامانی دەکەم».

ئەو ژنە نەیشاردەوە کە ئەگەرچی روبەڕوی هیچ حاڵەتێکی لەوشێوەیە نەبوەتەوە، بەڵام زۆرجار لەمامانیکردن دا ترساوە لەوەی ژنەکە لەژێر دەستی دا گیانلەدەست بدات.

لەبەرامبەردا، بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی ژنان و منالّبونی کەلار، جەختلەوەدەکاتەوە کە پرۆسەی منالّبون گۆڕانکاریی زۆری بەسەردا هاتوەو وادەخوازێت لەنەخۆشخانەو لەژێر دەستی پزیشک دا ئەنجام بدرێت.

د.بەناز جەلیل، بۆ (نەوژین) وتی: ئێستا رۆڵی مامان کەم بوەتەوە، چونکە کارەکە مەترسی تێدایەو واباشترە لەروی تەندروستی و یاساییەوە کە پزیشکان پێی هەستن.

وتیشی: ئێستا چەند ژنێک هەن کە وەکو مامان کاردەکەن، ئەوانیش بەپێی یاسا سەر بە بەشی چاودێریی ژنانی دوگیانن و ئەوان چاودێریی کارەکانیان دەکەن.

کە باس لە منالّبون دەکرێت، ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە کە جاران ژنان لەلای مامانەکان منالّیان دەبو و ئاسایی بو، بەڵام ئێستا بۆ یاساغ کراوە؟

لەوەڵامدا (د. بەناز جەلیل) دەڵێت: جاران زۆربەی ژنان کە بەسروشتی منالّیان بوە و کارێکی باشبو لای مامانەکان و هەندێک دەرمان و رونی روەکیان بەکار هێناوە کە بەسود بون، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەکارێکی باشە ژنانی دو گیان رو لە مامانەکان بکەن.

زیاتر رونیکردەوە «ئێستا ژیان گۆڕاوە و ژنانیش وەکو پیشو زۆر چالاکییان نییە، ئەمەش کار دەکاتە سەر ژنان لەکاتی منالّبون».

ئەو پزیشکە ئاماژەی بەوەکرد کە مامانەکان بەتەنها بۆ پرۆسەی لەدایکبونی سروشتی بەکەڵک هاتون، هەندێکجاریش لەکاتی منالّبون دا کردەوەکە وادەخوازێت بە نەشتەرگەریی بکرێت، ئەمەش زیانی بۆ ژنەکە دەبێت.

وتی: «ئەگەر مامانێک لەماڵەوە مامانی بکات و هیچ پێداویستیەکی نەبێت چۆن دەتوانێت کارەکەی بکات، بەتایبەتی زۆرجار منالّبونەکان بە سروشتی نابن و پێویستیان بەنەشتەگەری هەیە، ئەمەش وایکردوە زۆرجار حاڵەتی بەپەلەی بەردەست مامانەکان بگەنە لامان».

ئێستا زۆرتر مامانەکان لەناو ئاوارەکان دا برەویان هەیە

* ئەندامی تیمی رێکخراوی وادی لەگەرمیان

# ژنان شێرپەنجە دەبەزێنن



■ نەوژین، فاتمە جومعە

**ئەگەرچی بەیەکێک لە نەخۆشیە سەخت و دژوارەکان ناودێر دەکرێت، بەڵام ئەمە واینەکردوە شێرپەنجە بتوانێت چۆک بە ژنان دا بدات، بەڵکو ژمارەیەکی بەرچاو لەو ژنانە، توانیویانە نەخۆشیەکە ببەزێنن و سەرلەنوێ دەست بەژیانی ئاسایی خۆیان بکەنەوە.**

لەماوەی چەند ساڵی رابردودا، حاڵەتەکانی توشبون بە نەخۆشی شێرپەنجە لە کوردستان زۆر بون، لەنێویشیاندا لەگەرمیان، ئەگەرچی بەهۆی نەبونی نەخۆشخانەو بەشی تایبەتمەندەوە لە سنورەکە، رێژەو ژمارەی حاڵەتەکە نازانرێت.

لەنێو ژناندا، زیاتر لە هەر جۆرێک، شێرپەنجەی مەمک، بەربڵاوترین جۆری شێرپەنجەیە، بەدوای ئەویشدا جۆرەکانی تر دێت. هەمو ئەم جۆرانەش، سەرباری سەختی و دژوارییان، بەڵام ژنانیان بێ ئومێد نەکردوە لە چاکبونەوە.

سۆیبە ئەحمەد، ٤٦ ساڵ، توشبویەکی شێرپەنجەیە، بەم شێوەیە باسی توشبونی بە نەخۆشیەکەی کرد «لەسەرەتادا کۆمەڵێک نیشانەی نەخۆشیم لەسەر دەرکەوت، بەڵام نەمدەزانی کە شێرپەنجەیە، زو زو هیلاک دەبوم و نەم دەتوانی هیچ کارێک بکەم، تەنانەت سەردانی مەلا و شێخیشم کرد، بەڵام سودی نەبو تا دواجار پشکنینان بۆ کردم و گرێیەکیان لە سینگمدا دۆزییەوە، دواتر پێیانوتم کە توشی شێرپەنجەی مەمک بویت».

ئەم روداوە ماوەی زیاتر لە ١٠ ساڵی بەسەردا تیپەڕیوە و لەو ماوەیەدا (سۆیبە) چەندین جۆری چارەسەری وەرگرتوە «وەرگرتنی چارەسەرەکانم زۆر قورسبو بەتایبەت کاتێک کە دەرزی کیمیایان لێدام ئازارەکەی زۆر قورسبو».

لەماوەی ئەم ١٠ ساڵەدا، زۆر روداو بەسەر ئەم ژنەدا هاتوە، بەڵام روداوێک بەلای خۆیەوە لەهەموی تایبەت تر بوەو ئومێدی بۆ گەڕاندوەتەوە «روداوێک کە بو بە تروسکەی هیوا لەژیانم، ئەوەبو کە پێیان وتم تو دو گیانیت، ئەم هەواڵەم لەناوەڕاستی وەرگرتنی چارەسەرەکانمدا زانی، بەڵام ئێستا ئەو مناڵە ئومێد بەخشەی ژیانم باش گەورەبوە و ئێستا خاوەنی ٣ مناڵم و هاوکاری هاوسەرەکەم زیاتر خۆڕاگری پێبەخشیم».

تەنها (سۆیبە) نییە کە توشی شێرپەنجە بوبێت و بەکۆڵنەدانی روبەروی ئەم نەخوشیە بوبێتەوە، (ئیمان)یش چیرۆکێکی ترە.

ئیمان کەمال، ٢٥ ساڵ، بۆ (نەوژین) چیرۆکی خۆی گێڕایەوە لەگەڵ شێرپەنجە «ئێستا ٦ مانگە هەست بەباشی دەکەم و هەوڵی دوبارە دروستکردنەوەی ژیانم دەدەم و خەریکی بونیادنانی ماڵێکی تازەین، چونکە بەهۆی توشبونم بەو نەخۆشیە هاوسەرەکەم هەمو ماڵ و موڵکی فرۆشت لە پێناو چاکبونەوەم».

ئاماژەی بەوە کرد کە لە سەرەتا دا بەهۆی نەدۆزینەوە و دەستنیشان نەکردنی نەخۆشیەکەیەوە کۆمەڵێک چارەسەری هەڵەی وەرگرتوە کە دواتر بارەکەی لەسەر قورستر کردوە «سەرەنجام هاوسەرەکەم بڕیاریدا بمبات بۆ هیندستان بۆ دۆزینەوەی نەخوشیەکەم، دوای پشکنین پێیان وتم کە توشی شێرپەنجەی گەدە بوم».

روداوێک کە هەرگیز بیری (ئیمان) ناچێتەوە، ئەوکاتە بوە کە لەکاتی وەرگرتنی چارەسەر دا کچەکەی نەیناسیوەتەوەو لێی ترساوە «دوای تاشینی سەرم بۆ چارەسەر، کچە بچوک و تاقانەکەم نەدەهات بۆلام و لێم دەترسا، ئەم ئازارەم قەت بیر ناچیت، چونکە کچەکەم زۆر بچوک بو تەمەنی ٢ ساڵ بو، بەڵام بە یارمەتی هاوسەرەکەم و گرنگیدانی بەکچەکەمان، ئەو دۆخە دژوارەمان تێپەڕاند».

هەندێکی تر لەخانمان سەرەڕای ئەوەی لەتەمەنێکی گەورەتر دا توشی ئەم نەخۆشییە بون، بەڵام کۆڵیان نەداوە و روبەڕوی بونەتەوە.

گەلاوێژ، ناوێکی خوازراوی ئافرەتێکی ٦١ ساڵی دانیشتوی گەرمیانە. وتی: «من توشی شێرپەنجەی کۆڵون بوم، لەبەر ئەوەی زو نەخۆشیەکەمان زانی و لەقۆناغی سەرەتایی توش بوندا بوم، بۆیە بەنەشتەرگەری چارەسەرم بۆ کرا».

وتیشی: «ئەو ماوەیە ماوەیەکی سەخت بو بۆم، بەڵام هەمیشە ئومیدم بەخۆم دەبەخشی و هاوسەرەکەشم یارمەتی زۆری دەدام».

### شێرپەنجە لەروی تەندروستیەوە چییە؟

د. ژیان خەلیل، پسپۆڕی نەخوشیەکانی مەمک، وەڵامی چەند پرسیارێکی (نەوژین) لەبارەی شێرپەنجەوە دەداتەوە.

* شێرپەنجە چییە؟

شێرپەنجە زیادبونی خانەکانی لەشە کە بە شێوەی ناسروشتی زیاد دەکات و دواتر دەبێتە گرێ.

* هۆکارە دیارەکانی دروستبونی شێرپەنجە چییە؟

هۆکار زۆرن بۆ دروستبونی شێرپەنجە، لەوانە: تەمەن و چونە نێو تەمەنەوە، بۆ ماوەی (واتا توشبوی شێرپەنجە لەنێو بنەماڵەدا هەبێت)، کحول (خواردنەوەی مادە سەرخوشکەرەکان) و هەروەها قەڵەویی.

* چارەسەر چییە بۆ ئەم نەخۆشییە؟

چارەسەرەکان جیاوازن بۆ ئەم نەخۆشییە، بەپێی قوناغی نەخۆشییەکە دەگۆڕێت، واتا تا زوتر ئەم نەخۆشییە دەستنیشان بکرێت چارەسەرەکەی ئاسانترە.

* چۆن خۆمان بپارێزین؟

ناتوانین بەتەواوی رێ لە توشبون بەم نەخۆشییە بگرین و کەس نازانێت کە توش دەبێت، بەڵام دەکرێت رەچاوی کومەڵێک خاڵ بکەین، لەوانە: خواردنی سەوزە ومیوە و خواردنی تەندروست، وەرزشکردن، شیردانی مناڵ (لەسەر دایکان پێویستە شیر بەمناڵەکانیان بدەن بۆ خۆپاراستن لەم نەخۆشیە)، نەخواردنی حەپی رێگری لە دوگیانی (مەنع) چونکە دەکرێت ببێتە هۆکاری توشبون بەم نەخۆشییە.

سەرباری ئەمانەش پێویستە خانمان لەماڵەوە بەتایبەت بۆ شێرپەنجەی مەمک پشکنینی پێشوەخت بۆ خۆیان بکەن و لەکاتی بونی هەر گومانێک سەردانی پزیشک بکەن.

# بۆچی کوڕان و کچان لە قوتابخانە جیا دەکرێنەوە؟

■ نەوژین، دیمەن ئیسماعیل

**کچان و کوڕان لە قوتابخانەو ئامادەییەکانی گەرمیان، لەکاتێکدا قۆناغی بنەڕەتی لەگەڵ یەکتردا دەستپێدەکەن، بەڵام بۆماوەیەک و بەتاییەت لەو قۆناغەی پێشوتر پێی دەوترا ناوەندی، لەیەکتر دادەبڕێنرێن، پاشان لە ئامادەیی دا جارێکی تر هەردو رەگەزەکە تێکەڵ بە یەک دەکرێنەوە. ئەم دابڕان و تێکەڵکردنانەش، وادیارە لێکەوتە و کاریگەریی خۆی بەجێدێڵێت.**



جیاکردنەوەی کوڕان و کچان لەناوەندەکانی خوێندن، لێکدانەوەو بۆچونی جیاوازی دروستکردوە، لەکاتێکدا هەندێک بە پاساوی «هەڵەنەکردن» بە گونجاوی دەزانن، هەندێکی دیکەو بەتایبەت شارەزایان، وایدەبینن کە دەبێتە هۆی ئەوەی بۆشایی پەیوەندیی دروستی نێوان کچان و کوڕان بە فراوانی بمێنێتەوەو بۆ داهاتوش کاریگەریی لەسەر دەرونی هەردولا بەجێبهێڵێت.

شۆخان محەمەد، ١٨ ساڵ، خوێندکاری ئامادەیی شێروانەی کچانە، وتی: «پێموایە بە جیا بمێنینەوە باشترە، چونکە ئەگەر وانەبێت ئەوا هەست بە شەرم دەکەم لەبەرامبەر کوڕانی هاوپۆل، کە ئەمەش کاریگەریی دەبێت لەسەر خوێندنەکەم».

ئەم حاڵەتە نەرێنیە، ئەگەر زۆرێک لە کچان و کوڕان هەستی پێبکەن، ئەوا لەلای بەڕێوەبەری پەروەردەش بەهەمانشێوە جێگەی تێبینییە.

م. دارا ئەحمەد، بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی گەرمیان، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «جیاکردنەوەی کوڕان و کچان کاریگەری گەورەی نەرێنی دەبێت، ئەم جیاکاریە لە پاشەڕۆژدا رەنگ دەداتەوە».

وتیشی: هۆکاری ئەم کاریگەریە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە قۆناغی ئامادەیی لە گەڵ کوڕان دابڕاوە کە تەمەنێکە بە تەمەنی هەرزەکاری «مراهقی» دەناسرێت، بە تایبەتی لە ئامادەیی دا کچان خۆیان دەناسنەوە زیاتر پێویستیان بەوەیە ڕەگەزی بەرامبەر بناسن.

بەڵام بەپێچەوانەوە، بەڕێوەبەرێکی خوێندنگای کچان رایەکی جیاوازی هەیە، پێیوایە جیاکردنەوەی کچان لە کوڕان، کاریگەری ناکاتە سەر باری دەرونیان.

روخۆش رەئوف، بەڕێوەبەری ئامادەیی شێروانەی کچان، بۆ (نەوژین) وتی: «ئەم جیاکاریە کاریگەری ناکاتە سەر دەرونی کچان و نابێتە هۆی دروست بونی شەرم، من لە خوێندنگای کچان خوێندومە و رۆشتومەتە زانکۆ و هەستم بە شەرمیش نەکردوە».

بە پێی ئاماری بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەلار، بۆ وەرزی خوێندنی (٢٠١٧-٢٠١٨)، لە کۆی ٣٥ خوێندنگای ئامادەیی، دو خوێندنگایان تایبەت بە کچانن و ئەوانی تر تێکەڵن.

بەرای توێژەرێکی کۆمەڵایەتیی، جیاکردنەوەکە کاریگەریی خراپی زۆرترە.

کارزان فوئاد، توێژەری کۆمەڵایەتی، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «ئەم جیاکاریە وا لە کچان و کوڕان دەکات کە تەنها وەک جەستە و غەریزە سەیری یەکتر بکەن، دەبێتە هۆی دروستبونی کەبتی جنسی لە نێوان هەردو رەگەزدا».

زیاتر رونیکردەوە «ئەم حاڵەتە کچان و کوڕان توشی گرێ و گۆڵی دەرونی و کۆمەڵایەتی دەکاتەوە لە ئێستا و ئایندەدا، لە ئێستادا کوڕان بۆ تێر کردنی ئەو بۆشاییە لای قوتابخانەی کچان بە کۆمەڵ دەوەستن، کچانیش ژورەکان و کتێبەکانیان بە وێنەی کوڕ دادەپۆشن، بۆیە هەرگیز تێگەشتنیان بۆ یەک نابێت».

خودی کچانیش لەبارەی ئەم حاڵەتەوە، رای پێچەوانەیان هەیە.

لەکاتێکدا (گۆنا بەکر) کە خوێندکاری زانکۆیە پێیوایە ئەم جیاکردنەوەیە کارێکی باشەو «دەبێتە هۆی لادانی کچان و کوڕان لە هەڵە»، بەڵام پەیام ئیسماعیل، رایەکی پێچەوانەی هەیە.

ئەو کە تەمەنی ١٧ ساڵەو خوێندکاری ئامادەییە لەکەلار، بۆ (نەوژین) وتی: «بە ویستی خۆم قوتابخانەی تێکەڵم هەڵبژاردوە و بە ئاسودەیی هەڵسوکەوت لەگەڵ کوڕان دەکەم و هەست بە گۆشەگیری ناکەم».

وتیشی: «لە هەمان کاتدا توشی بەدحاڵی بون نابین لەیەکتری، بەڵکو رێزی یەکتر دەگرین».

# ژنانی رزگاربوی ئەنفال هەم دایک بون و هەم باوک


فۆتۆ: دلێر عەبدولڕەحمان

■ نەوژین، پەرژین کامەران

**ژنانی رزگاربوی شاڵاوی ئەنفال، لەدوای لە دەستدانی هاوسەرەکانیان، بەو پەڕی بەهێزی و خۆڕاگرییەوە لە کۆمەڵگایەکی پیاوسالاریدا، روبەڕوی رۆژگارە تاڵ و سەختەکانی گرانی و هەژاری و نەبونی بونەوە، لە یەک کاتدا بون بە دایک و باوکیش بۆ مناڵەکانیان.**

ئەنفال تەنیا ئەوانەی زیندە بەچاڵ نەکرد بەعس بەزیندویی بردنی و ئێسقانەکانیان هاتەوە، بەڵکو ئاسەواری دەرونی و کولەمەرگی لەژیانی ئەو دایکە رەشپۆشانەشدا بەجێهێشت کە هاوسەرەکانی بەزیندویی خستنە ژێرخاک.

لە شاڵاوی دڕندانەی ئەنفالدا ژمارەیەکی زۆری ژنانی گەرمیان هاوسەرەکانیان بێسەر و شوێنکران و زیندە بەگۆڕ کران و مناڵەکانیان بێ باوک مانەوە. ژنان دوای لەدەستدانی هاوسەرەکانیان ئەرکێکی قورس کەوتە ئەستۆیان، ژیانی خۆیان تەرخان کرد بۆ گەورەکردنی مناڵەکانیان و کارکردن لە پێناویاندا.

گوڵباخ سالح، ٦٢ ساڵ، ژنێکی ستەمدیدەی دانیشتوی ناحیەی رزگارییە، بە چرچیەکانی روخساریەوە دیارە چەندێک رۆژگاری تاڵ و سەختی بەڕێکردوە. بەمجۆرە باسی خۆی بۆ (نەوژین) گێڕایەوە «کە هاوسەرەکەم لە دەستدا خاوەنی شەش مناڵ بوم، لەپێناو گەورەکردنیان دەستم کرد بەکارکردن، لە بەیانی تا ئێوارە کارم دەکرد سەرەڕای ئەرکی ماڵەوە، لەکاتی کارکردن لە دەرەوە بیرم لای ماڵ و مناڵەکانم بو کە بەجێمهێشتبون».

«ئیش نییە نەم کردبێت بەهۆی نەبونی لە پێناو بەخێوکردنی مناڵەکانم، ئێستاش بەردەوامم لە کار کردن».

(روناک شوکر)ی ٥٣ ساڵ، دانیشتوی هەمان ناحیە، وای وت.

خەون و خەیاڵی دایکان بۆ داهاتوی مناڵەکانیان و بون بەخاوەن پیشەیەک، زیاتر هێزی پێ بەخشیون بەبێ هاوسەر لەژیان بەردەوام بن و مناڵەکانیان هەست بە بێ باوکی نەکەن، بەهێز و بازوی خۆیان بژێوی رۆژانەیان بۆ دابینکردون.

سەدریە عوسمان، بۆ (نەوژین) ئاوا باسی رۆژگاری دوای ئەنفالی هاوسەرەکەی دەکات: «بەهەمو شێوەیەک هەوڵم دەدا و کارم دەکرد، بۆ ئەوەی مناڵەکانم بێ باوکییان پێوە دیار نەبێت و خوێندن تەواوکەن، ئەگەرچی لەو سەردەمە دا پێداویستی خوێندن گران و کەم بو تەنانەت کاغەزی چیمەنتۆم هێناوە بۆ ئەوەی ئیملای لەسەر بکەن».

ئامین شەریف، قوربانیەکی تری ئەنفال، بە ئاهێکی قوڵەوە دەربارەی بێ باوکی مناڵەکانی ئەدوێت «بژی و نەمری ئەژیاین، رۆژێک کارم نەکردایە بە ژیانمانەوە دیاربو، ئەو سەردەمە گرانی بو کارکردنێکی زۆر بە رۆژانەیەکی کەم، سەرەڕای ئەوەش هەوڵم دەدا مناڵەکانم لە خوێندن دانەبڕێن».

ئەو ژنە بە رەنجی شانی خۆی مناڵەکانی بەخێو کردون، بەڵام هەمیشە ئومێدی ئەوە بوە باوکی مناڵەکانی بگەڕێتەوە.

ئەم رەنجەی ژنانی پاش ئەنفال داویانە، وادیارە بەهەدەر نەچوە، بەڵکو زۆرێکیان توانیویانە مناڵەکانیان پێبگەیەنن و خوێندن تەواو بکەن، گەنجان و نەوەی دوای ئەنفالیش رەنج و ماندوبونی دایکیان بەرز دەنرخێنن.

بەختیار رەئوف، خوێندکاری زانکۆ، کوڕی یەکێک لەو ژنانەی کە بۆ رۆژنامەکەمان دواون، دەڵێت: «ئەگەر لەکەسێک بپرسی باسی دایک بکات باوکیشی مابێت و ئەرکێکی زۆر لەسەردایکی نەبێت، ڕەنگە نەتوانێ پێناسەی دایک بکات، ئاخۆ ئێمە چۆن بتوانین وەسف و پێناسەی دایکمان بکەین؟!».

وتیشی: «دایکم ئەو بۆشاییەی بەهۆی لەدەستدانی باوکمانەوە دروست ببو پڕی کردبوەوە، بەجۆرێک هەست بە بێ باوکی نەکەین لە روی مادی و مەعنەویەوە».

گەوهەر حەسەن، مامۆستا، کچی پیاوێکی ئەنفالکراوە، هەمان بۆچونی (بەختیار)ی هەیە «من شانازی بەدایکمەوە دەکەم بەو شێوەیە ئێمەی پەروەردە کردوە، رەنج و ماندوبونی زۆری کێشاوە لە پێناوماندا، جێگەی باوکیشی بۆ پڕ کردینەوە، تا مردن قەرزاری دایکمانین».

---

# مناڵان لەبارەی ئەنفالەوە کەم دەزانن



فۆتۆ: دلێر عەبدولڕەحمان

■ نەوژین، زریان محەمەد

**کاتێک لە (دالیا)مان پرسی: ئەنفال چیە؟ بە سادەییەوە وتی: «نازانم، بیستمە کورد زۆر کوژیاون».**

ئەگەرچی بەشێکی گەورەو بەرفراوانی تاوانی ئەنفال ناوچەی گەرمیانی گرتوەتەوە، بەڵام ئەوەی مایەی تێبینییە، ئەوەیە کە زۆرێک لە مناڵان ئاشنا نین بەم تاوانە.

٢٠١٨/٤/١٤، سی ساڵ بەسەر یادی تاوانی ئەنفال دا تێدەپەڕێت، کاتێک لەساڵی ١٩٨٨ دا رژێمی بەعس گوندنشینانی کوردستانی بەتایبەت لەسنوری گەرمیان راگوێزا و زۆرینەی زۆری لێ شەهید کردن و ئەوانی تریشی بۆ کۆمەڵگە زۆرە ملێیەکان گواستەوە.

ئەوەی لە گێڕانەوەی ئەم تاوانەدا جێگەی سەرەنجمان بو، ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆر کەم لە مناڵان لەبارەیەوە دەزانن، بەشی زۆریان یان نازانن روداوەکە چییە، یاخود زانیاریەکی کەمیان هەیە.

دالیا ئوسامە، ١٣ ساڵ، قوتابی پۆلی حەوتەمی بنەڕەتی لە شاری کەلار بە سەرسامییەکەوە سەبارەت بە یادی ئەنفال بۆ (نەوژین) وتی: «من هیچ نازانم سەبارەت بە یادی ئەنفال تەنها ئەوە دەزانم کە لەو رۆژەیا زۆر کەس لە ناوبراوە ئیتر زانیاریم لەسەر روداوەکە نیە».

وتیشی: لە قوتابخانەش هیچ کات باسی ئەمەیان نەکردوە کە ئەنفال چیە، تەنها ئەوەیان وتوە کە پارچەیەک پەڕۆی رەش بە خۆمان بکەین یان جلێکی رەش بپۆشین، چونکە یادی ئەنفالە، لەگەڵ ئەوەش خێزانەکەم هیچ کات باسیان نەکردوە و خۆشم پرسیارم نەکردوە.

هەندێک لە مناڵان زانیاری ئەوتۆیان لەسەر شاڵاوی ئەنفال نیە ئەوەی دەیزانن تەنها ئەوەیە کە خەڵکانێکی زۆر لەو کاتەیا لەناوچون.

گوڵان ئیسماعیل، ١٢ ساڵ، قوتابی پۆلی شەشەمی بنەڕەتیە لە شاری کەلار، بە روخسارێکی پێکەنیناوییەوە دەیڕوانی و سەبارەت بە ئەنفال بۆ (نەوژین) دەڵێت: «من هیچ لە بارەی ئەنفالەوە نازانم، هیچ کات پرسیاریشم نەکردوە سەبارەت بەم رۆژە چی رویداوە، تەنها ئەوەی بیستبێتم خەڵکانێکی زۆر مردون و نازانم چۆن بوە».

وتیشی: تەنها هەندێک جار گوێم لێدەبێت باوکم باسی دەکات کە خەڵکانێکی زۆر مردون، ئەگینا شتێکی وای نەوتوە کە چۆن و لە لایەن کێوە کراوە، بۆیە من نازانم بە تەواوی ئەنفال واتای چییە.

لە مێژوی نوێی میلەتی کورد دا، یەکێک لە دیارترین ئەو کارەسات و تاوانانەی بەسەریدا هێنراوە، ئەنفالە، بەڵام ئەوەی مایەی تێبینیە ئەوەیە کە مناڵان زانیارییەکی ئەوتۆیان لە بارەی ئەو شاڵاوەیەوە نیە و نە لە قوتابخانە لە نێو خێزانەکاندا ئەم روداوە بۆ مناڵان باس نەکراوە.

ناز سەباح، ١١ ساڵ دانیشتوی شاری کەلارە، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «من نازانم کارەساتی ئەنفال واتای چیە، هیچ شتێکیش لە بارەیەوە نازانم، هیچ کاتێکیش پرسیارم نەکردوە سەبارەت بەوە».

وتیشی: نە لە خێزانەکەم نە لە قوتابخانەش هیچ کات گوێبیستی وشەی ئەنفال نەبوم ئەگەر باسیش کرابێت من بیرم نایەتەوە، ناشزانم ئەم روداوە چۆن بوە و لە لایەن کێوە کراوە هەرکەسێکیش لێم بپرسێت ئەڵێم نازانم چونکە هیچ زانیاریم لەسەری نیە. بەڵام بە پێچەوانەوە هەندێک خێزان زانیارییان بە مناڵەکاانیان بەخشیوە سەبارەت بەو تاوانانەی کە بەرامبەر بە کورد کراوە لە نێویشیاندا ئەنفال.

رۆژ محەمەد، ١٣ ساڵ، دانیشتوی شاری کەلارە و قوتابیە، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «ئەوەی کە دەیزانم ٤-١٤ یادی ئەنفالە و (سەدام حسین) و رژێمی بەعس بە چەکی قورس لە کوردی داوە و رقی لە کورد بوە و چەندین تاوانی بەرامبەر بە کورد کردوە».

وتیشی: من ئەم زانیارییانەم لە خێزانەکەم وەرگرتوە کە هەمیشە باسی دەکەن لە ماڵەوە کە کورد چی بەسەر هاتوە، لەگەڵ ئەوەش لە قوتابخانە هیچ باسی ئەم یادە ناکەن و گوێبیست نەبوم.

شارەزایەکی بواری پەروەردە، باسلەوەدەکات کە لە پرۆگرامەکانی خوێندن دا، کەموکورتیەکی زۆر هەیە لەبارەی تاوانی ئەنفالەوە.

سەباح عەلی جاف، بۆ (نەوژین) وتی: لەرێگەی پرۆگرامەکانەوە هیچکات بەشی پێویست مناڵان ئاشنا نابن بەو کۆست و کارەساتەی کەبەسەر میلەتەکەیاندا هاتون، کە ئەمەش نەنگیی و کەموکورتییە.

ناوبراو کە خاوەنی چەندین لێکۆڵینەوەو نوسین و کتێبی چاپکراوە لەبواری ئەنفال و خۆیشی مامۆستایە، ئاماژەی بەوەکرد دەبێت حکومەت خەمێک لەم بوارە بخوات و چیتر قوتابیان بە بێئاگایی لە بارەی ئەو تاوان و کارەساتانە نەهێڵێتەوە.

# لەکەلار دو خوشک پێکەوە نانەواخانەیەک بەڕێوەدەبەن

■ نەوژین، ئەسما کەریم

**لەقەزای کەلار دو خوشک هەستاون بەکردنەوەی نانەواخانەیەک، کە بە شێوازێکی کوردەواری نانی تێدا دروست دەکەن، ئەم دو خوشکە پڕۆژەی دروستکردنی نانەواخانەکەیان بە سەرکەوتو وەسف دەکەن و هەروەک خۆشحاڵی خۆشیان دەردەبڕن لە سەرکەوتنی پیشەکەیاندا.**

نانەواخانەی کوردەواری دایک، ناوی ئەو کارگەیەیە ماوەی پێنج مانگە کراوەتەوە کە تایبەتە بە دروستکردنی نان بەشێوازی خۆماڵی، لەم کارگەیەدا (نانی خۆماڵی هەورامی، نانی تەنوری و کولیچە) دروست دەکرێن.

(پەروین حەسەن) و (نەسرین حەسەن)، ئەو دو خوشکەن کە هەستاون بەکردنەوەی ئەم نانەواخانەیە، رۆژانە بەیەکەوە نانەواخانەیەک لەگەڕەکی سیروان بەڕێوەدەبەن.

پەروین حەسەن، ٣٤ ساڵ، باسی سەرەتاکانی وەرگرتنی ئەزمونی لەم پیشەیەدا بۆ (نەوژین)دەکات: «پێش ئەوەی دەست بکەین بەکردنەوەی ئەم نانەواخانەیە، لەنانەوای دیکە ئیشمان دەکرد، هەر لەو رێگەیەشەوە توانیمان ئەزمونێکی باش لەم کارە وەربگرین».

بەزۆرینەی رەها پیاوان لەماڵەوەدا ئەرکی دابینکردنی بژێوی خێزانیان دەکەویتە ئەستۆ، بەڵام ئەم دو خوشکە بەپێچەوانەوە، ئەوان دابینکردنی بژێوی ماڵەوەیان لەئەستۆ گرتوە.

لەم بارەیەوە، نەسرین حەسەن، ٣٦ ساڵ، دەڵێت: «باوکم خانەنشین کراوە و ئێستا لە ماڵەوەیە و توانای هیچ کارێکی نەماوە، هەر بۆیە ئێمە ئەرکی دابینکردنی بژێوی خێزانەکەمان لە ئەستۆ گرتوە».

وتیشی: «ئەم نانەواخانەیە سودێکی زۆر باشی پێ گەیاندوین لەروی داهات و بژێویەوە».

زۆرێک لە ئافرەتان بە پاساوی ئەوەی روبەڕوی کێشە و ئاستەنگ دەبنەوە لەکاتی کارکردندا، خۆیان لەقەرەی ئیشکردن نادەن، ئەگەرچی خاوەنی بەهرەو کات و توانای باشیشن.

سەبارەت بەوەی لەکردنەوەی ئەم نانەوا خانەیەدا تاچەند ئاستەنگیان بۆ هاتوەتە پێش، (پەروین) بۆ (نەوژین) دەڵێت: «تاوەکو ئێستا هیچ ئاستەنگێکمان بۆ دروست نەبوە، ماڵەوەشمان پاڵپشتێکی هەرە مەزنی ئێمەن».

> تاوەکو ئێستا هیچ ئاستەنگێکمان بۆ دروست نەبوە

> ماڵەوەمان پاڵپشتێکی هەرە مەزنی ئێمەن

ئاماژەی بەوەشکرد: «ئەو کڕیارانەی کە سەردانمان دەکەن بەمەبەستی نان کڕین، دەستخۆشیەکی زۆرمان ئاراستە دەکەن و هیوای بەردەوامیمان بۆ دەخوازن».

کاری هەویرکاری، کاتێکی زۆر و ماندوبونێکی زیاتری دەوێت، چونکە بە چەند هەنگاوێک دا تێدەپەڕێت تاوەکو دەکرێت بە نان، هەربۆیە لە کاتژمێر چواری بەیانی دەستپێکی کارەکەیان دەبێت لە نەنانەواخانەکەیان، تا چواری ئێوارە لەوێ دەمێننەوە.

ئەو دو خوشکە ئاماژەیان بەوەکرد، ئەگەرچی ئەرک و کارەکەیان قورسەو کاتی زۆریان دەبات، بەڵام دڵخۆشن بەوەی کار و داهاتی خۆیان هەیە.

لەو کاتەی کە (نەوژین) چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەو دو خوشکەدا دەکرد، (محەمەد) وەک کڕیار سەردانی ئەو نانەواخانەیەی دەکرد، سەرنجی خۆی لەبارەی کردنەوەی نانەواخانەیەکی لەم شێوەیە کە دو کچ بەڕێوەی دەبەن و بونیادیان نابێت، بۆ (نەوژین) بەمشێوەیە خستە رو: «زۆربەی کات بەمەبەستی کڕینی نان دێمە ئەم نانەواخانەیە، زۆر بە جوانی کارەکەیان ئەنجام دەدەن و هیچ گلەییەکم لێیان نییە».

شێنێ، کڕیارێکی تری ئەم نانەواخانەیەیە، هاوڕایە لەگەڵ بۆچونەکەی (محەمەد) و وتی: «زۆر دڵخۆشم بە کردنەوەی ئەم نانەواخانەیە لەلایەن ئەم ٢ خوشکە و هەر کات نانمان لەماڵدا کەم بێت، دێم و لێرە نان دەکڕم».

# ژنە کێکفرۆشەکەی کەلار

■ نەوژین، سەرگوڵ خەلیل

**(روخۆش) لە چێشتخانەکەیدا بەهێمنی و تەرکیزەوە، سەرقاڵی رازاندنەوەی ئەو کێکە بو کە خۆی دروستی کردبو، کرێم و بابەتی جوانکاریی لەسەری دادەنا کە رەنگێکی جوان و دیمەنێکی سەرنجراکێشیان پێبەخشی بو، لە نیگاشی دا ئەوەندەی هەستت بە شانازیی و ئاسودەیی دەکرد، هێندەی ئەوە ماندوبون و بێزارییت نەدەخوێندەوە.**

روخۆش موسا، ژنێکی دانیشتوی شاری کەلارە. ماوەی ٥ ساڵە بەکاری دروستکردن و رازاندنەوەی کێک بۆ بۆنەو ئاهەنگەکانەوە سەرقاڵە، ئەو ئەگەرچی کارگەیەکی تایبەت بەخۆی نییە، بەڵام بە پێداویستییە دیارییکراو و توانا سنوردارەکەیەوە، وەکو وەستایەکی شارەزای شیرینی دروستکردن دەردەکەوێت.

بەدەم بەردەوام بون لە رازاندنەوەی کێکەکەی بەردەستی، گەڕایەوە بۆ سەرەتاکانی کارەکەی و وتی: «خوشکەکانم فەرمانبەرن، منیش ویستم کارێک بکەم جێ پەنجەم دیار بێ، ئەو ماوەیەش دۆخی مادیمان تۆزێک لاواز بو، بۆیە حەزم کرد ئیشێک بکەم و هاوکاری مێردەکەشم بکەم لە رایيکردنی لایەنی دارایی خێزانەکەمان دا».

ئەو ژنە ماوەی ٥ ساڵە کێک بۆ بۆنەو ئاهەنگەکان بەتایبەتی ئەوانەی لەدایکبون دروست دەکات، کارەکەش هەر لەماڵەوە ئەنجام دەدات.

وتی: «من کارەکانم لەماڵەوە دەکەم و هەمو پێداویستیەکی دروست کردنی کێکم هەیە لەماڵەوە».

بەڵام ئەگەر کارەکەی لەماڵەوە دەکات و دوکان و شوێنکارێکی نیە لە بازاڕدا، خەڵکی چۆن دەیناسنەوەو چۆن پەیوەندی پێوەدەکەن؟

لێرەدا سودی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دێتە ئاراوە.

روخۆش ئاماژەی بەوەکرد کە لەسەرەتای کارەکەیەوە، پشتی بە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوک بەستوە بۆ خستنەرو و نمایشی کارەکانی، هەر لەو رێگەیەشەوە رۆژانە داواکاریی بۆ دێت بۆ دروستکردنی کێک و شیرینی.

وتی: «من لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان کارەکانم پۆست دەکەم و بڵاوی دەکەمەوە و زۆربەی داواکاریەکانیشم هەر لە رێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانەوە بۆ دێت».

هەندێکجار منداڵ و ئەرکی ماڵەوە دەبنە رێگر لەوەی ئافرەتان ببنە خاوەن پیشەی خۆیان، بەڵام روخۆش کە زۆرجاریش بە «دایکی ئەحمەد» ناوی دەهێنن، دەڵێت: «مناڵەکانم نابنە رێگر لەبەردەم کارەکانمدا، بەڵکو کوڕەکانم زۆر هاوکاریم دەکەن لە ئیشی ماڵەوەو کێک دروست کردندا، چونکە کچەکانم مناڵن».

دەشڵێت: «ئەم کارەم بۆ پەیدا کردنی بژێوی ژیانی خۆم و هاوکاریکردنی مێردەکەمە، جگە لەوەی ئارەزوی خۆشم بوە، چونکە لە روی مادیەوە هاوکاریم دەکات».

> ئەم کارەم بۆ پەیدا کردنی بژێوی ژیانی خۆم و هاوکاریکردنی مێردەکەمە

لەوەڵامی ئەوەی رۆژانە چەند کاتژمێری داناوە بۆ کارکردن؟ روخۆش وتی: «کارەکانم بەپێی داواکاریە و هەر بەپێی داواکاریەکان کاردەکەم، ئەگەر بۆنەیەک هەبێت، ئەوا دەبێت بەیانی زو هەستم و دەستبەکار بکەم تا شەو، جاری واش هەیە داواکاریەکان کێکێک یا دو کێکە، نرخی کێکەکانیشم لە بازاڕ کەمترە».

ئەو ئافرەتانەی لەسەرەتاوە دەست دەبەن بۆ پیشەیەک روبەروی رەخنە یا رێگری دەبنەوە، بەڵام لەلای (روخۆش) رەوشەکە جیاوازە.

وتی: «لە ئیشەکەمدا هیچ گرفتێکم بۆ دروست نەبوە، بەڵام لەسەرەتاوە هەندێکیان وایان دەزانی تەنها کێک دروستکردنێکی ئاساییە، کاتێک بینیان و سەیری ئیشەکەیان کرد، دەست خۆشیان لێکردم و ئێستا خۆشیان یەکێکن لەوانەی داوا دەکەن کێکیان بۆ دروست بکەم».

بەخۆشحاڵیشەوە وتی: «ئێستا خەڵک هەموی دەست خۆشیم لێ ئەکەن، ئەمەش مەعنەویاتم بەرزم دەکاتەوە».

# مامۆستایەک قوتابخانەکەی گوڵڕێژ دەکات



> ئەو رۆژانەشی نەخۆش بومە هاتوم بۆ خزمەتی باخچەکەم

> ئەو باخچەیە وەکو بەشێک وایە لەژیانم، خوم پێوەی گرتوە

▪ **نەوژین، سەروەت باوەنوری**

**ئەگەرچی زۆرتر پیاوان کاری باخەوانی دەکەن و گرنگیی پێدەدەن، بەڵام لەناحیەی باوەنور مامۆستایەکی کچ ئەو رێچکەیە دەشکێنێت و زیاتر لە شەش ساڵە لەقوتابخانەکەیدا دەوامی خۆی دەکات و وەکو باخەوانێکیش رۆڵی بینیوە.**

سەمیرە محەمەد، ئەو مامۆستا ئافرەتەیە کەساڵانێکە لەناحیەی باوەنور لەقوتابخانەی ئامادەیی پێباز دەوامی ئاسایی خۆی دەکات و لەگەڵ ئەوەشدا لەنێو قوتابخانەکەدا باخچەیەکی جوان و سەرنجڕاکێشی دروست کردوە. ئەو باخچەیەی کە دروستی کردوە، پڕە لە گوڵ و بەرهەمی روەکی جۆراوجۆر و سەرنجراکێش، ئەمەش خۆشحاڵیی مامۆستایان و خوێندکارانی لێکەوتوەتەوە.

م.سەمیرە، بۆ (نەوژین) دواو وتی: «هەر لەسەرەتای دروستکردنی بینای نوێی قوتابخانەکەمان تاوەکو ئێستا، بەردەوام خەریکی ئەم باخچەیەم، زۆر دڵخۆشم کەتوانیومە سروشتێکی جوان بەقوتابخانەکەم ببەخشم و هەمیشە هەوڵم داوە وەکو کەسێکی ژینگەدۆست خزمەت بکەم».

ئەو مامۆستایە گەرمی هاوین و ساردی زستان کاریان تێ نەکردوە، وەکخۆی ئاماژەی بۆ دەکات زۆرجار بە هاوینان بەزمانی بە رۆژوەوە رۆشتوە بۆ ئاودانی گوڵەکان.

ئەوەشی نەشاردەوە کە رێگەی قوتابخانەکەی تۆزێک دورە و زۆرجار بەپێ دەڕوات و کەمجار ئۆتۆمبیل بەکاردەهێنێت بۆ رۆشتن بۆلای باخچەکەی. وتیشی: «ئەو باخچەیە وەکو بەشێک وایە لەژیانم، خوم پێوەی گرتوە».

ئەم کارەی م.سەمیرە، ئەگەرچی خزمەتێکی جوان و بەرچاوە بە ژینگەو قوتابخانەکە، کەچی هەندێکجار بەهۆیەوە روبەڕوی تانەو قسە بوەتەوە، بەڵام وادیارە ئەو قسانە ساردیان نەکردوەتەوە، هەربۆیە گەرمتر لە جاران بەردەوامە لەخزمەتکردنی باخچەکە. وتی: «هیچ کات قسەی خەڵکی کاری تێنەکردوم و ساردی نەکردومەتەوە لەخزمەت کردنم بەژینگەی قوتابخانەکەم».

قوتابخانەی ئامادەیی پێبازی تێکەڵ لەناحیەی باوەنور ساڵانیکە دروست کراوە، بەڵام ساڵی ٢٠١٢ لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بینایەکی نوێ و تایبەتی بۆ دروستکراوە، دواتر ئامادەیی پێباز رویان لەوێ کردوە، هەر لە سەرەتای کردنەوەی ئەو قوتابخانەوە تاوەکو ئێستا مامۆستا سەمیرە بەردەوام بەشەو و رۆژ خەریکی خزمەتکردنی باخچەی قوتابخانەکەیە و ئەمەش وایکردوە دیمەنێکی جوان و دڵرفێنی هەبێت.

کارزان عەلی، یەکێکە لە خوێندکارانی ئامادەییەکە، پێیوایە ئەو ئیشەی مامۆستا سەمیرە کردویەتی زۆر کەس ناتوانێت بیکات. ئەوەشی نەشاردەوە لەزۆربەی بۆنەو ئاهەنگەکاندا تاکە شوێن کەدیمەنێکی جوانی هەبێت و وێنەی لەتەنیشت بگرن ئەو باخچەیەیە کە م.سەمیرە ئاوەدانی کردوەتەوە و هەمیشە رو لەوێ دەکەن.

هەروەها خوێندکارێکی تریش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە مامۆستا سەمیرە لەگەڵ ئەوەی کە ژینگە دۆستە لەهەمان کاتیشدا کەسێکی بەخشندە و میهرەبانە.

خەندە سالار، وتیشی: «هەمیشە ئێمەی خوێندکار سودمان لە م.سەمیرە بینیوە و چەندینجار تۆوی گوڵ و گوڵیشی بەخوێندکارەکان داوە بۆئەوەی زیاتر قوتابخانەیان لا خۆشەویست بکات».

بەڕێوبەری قوتابخانەکەش پێیوایە نمونەی مامۆستای لەمجۆرە زۆر کەم و دەگمەنن لەخزمەت کردن لەبواری پەروەردەیی و ژینگەپارێزی و جوانکردنی سروشتی خوێندنگەکان دا.

م. عەلی ئەحمەد، وتی: «ئێمەش وەکو قوتابخانە هەمیشە هاوکاری بوین و بەدەم هەر داواکاری و داخوازیەکیەوە چوین لەگەڵی بوینە، چونکە شایەنی ئەوە بوە پێویستیەکانی جێبەجێ بکەین و بەدەمیەوە بچین».

ئەو رۆژەی کە ئێمە سەردانی (م.سەمیرە)مان کرد بۆ ئەوەی وێنەی بگرین بۆ راپۆرتەکەمان، بینیمان لە نێو باخچەکەدا خەریکی ئاوپەرژێنە، بە زەردەخەنەوە وتی: «ئەو رۆژانەشی کەنەخۆش بومە هاتوم بۆ خزمەتی گوڵ و باخچەکەم، چونکە پێموابوە ئەگەر خزمەتیان نەکەم گوناهبار دەبم».

---

# کارگوزارەکان... فریشتەکانی خاوێنکردنەوەی قوتابخانە



▪ **نەوژین، ژینۆ عەلی**

**لەهەمو قوتابخانەو فەرمانگە حوکمیەکاندا کەسانێک هەن کاری پاکڕاگرتنی ئەو شوێنانەیان لە ئەستۆدایە کە بە «کارگوزار» ناسراون و زۆرێکیان سەرەڕای زۆری تەمەن، بەڵام بێ ماندوبون کاری خۆیان دەکەن. ژنان لەم کارەدا لە کۆنەوە یەکسانیان لەگەڵ پیاواندا راگرتوە و بێ گوێدانە قسە هەمیشەییەکانی کۆمەڵگا و لەپێناو خێزانەکانیاندا، کاریان کردوە.**

زۆرێک لەژنان لەخوێندنگە و زانکۆ و پەیمانگاکان کاری پاککردنەوە دەکەن و خۆشیان بەخۆشحاڵ دەزانن کە کارێک ئەکەن پێی سەربەرزن.

ژیان عەلی، ٦٣ ساڵ، ژنێکە کاری پاککردنەوە دەکات. بۆ (نەوژین) وتی: «من بەبیرم بێت کارگوزارم و هەرجارە و لەمەکتەبێک کارم کردوە، خۆشحاڵیشم کە دەتوانم ئیش بکەم».

ئەو بەردەوام بو وتی: «خۆشحاڵیی و دڵخۆشیم لەوەوەیە چونکە کارەکەم بە سەربەزی ئەکەم و پارەیەکی حەڵاڵ بۆ ماڵەوەم پەیدا دەکەم».

ئەو ژنانەی کاری کارگوزاری دەکەن، باسلەوە دەکەن کە زۆرجار توانجیان لێدراوە و قسەی ناخۆشیان پێکراوە.

حەبیبە عاسی، کارگوزارێکی دیکەیە لە قوتابخانەیەکی کەلار، بۆ (نەوژین) دەڵێت: «چەندینجار تەلەبەکان پێیان وتوم بەو تەمەنەوە خەریکی پاککردنەوەی ژێر ئەو کورسیەی ئێمەن، ئێژی مردون لەبرسانا ئەم ژنە بەتەمەنانە کاری کارگوزاری ئەکەن»، حەبیبە، وتیشی: «ئێمە ئەو قسانە هیچ کاریگەری نیە لەسەر ئیشوکارمان، چونکە ئەوان منداڵن و نافامن، نازانن نەبونی چ دەردێکە».

بەپێچەوانەی توانج و قسەی نابەجێی هەندێک لەخوێندکاران، هەندێکیان یارمەتیدەری ژنانی کارگوزارن.

ئەژین عەلی، ١٩ ساڵ، خوێندکاری ئامادەییە، بۆ (نەوژین) وتی: «هەمو بەیانیەک زو دێمە دەوام بۆ ئەوەی یارمەتی ئەو ژنانە بدەم کە مەکتەبەکەمان پاک دەکەنەوە».

وتیشی: «هەندێک لەهاوڕێیانم نەک هەر بەو ژنانە بەڵکو بەمنیش گاڵتە ئەکەن، بەڵام من بەردەوام ئەبم و هەمیشە یارمەتیان ئەدەم، چونکە کارەکە بۆ پاکو خاوێنی ئێمەیە نەک عەیبە».

«کاتێک ئێمە ئەچینە قوتابخانە و زانکۆ و پەیمانگاکان و فەرمانگە حکومیەکان دەبینین پاکوخاوێنی پێوە دیارە، بێئەوەی ماندو ببین لەشوێنێکدا ئەخوێنین و کاتەکانمان تیایدا بەسەر ئەبەین و ئیش و کارەکانمان رایی دەکەین، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هەبونی ژنانی کارگوزار و ئازایی و بەغیرەتی ئەوان».

ئەمە قسەی یەکێک لەو خوێندکارانە بو کە لەپەیمانگای تەکنیکی کەلار دەخوێنێت.

رێژین، بەردەوام بو و وتی: «هیچ کات ئێمە هەستمان بەپیسی ئەو هۆڵە نەکردوە کە تیایدا دەخوێنین، کاتێک ئەو هۆڵانە پاکوخاوێنن لە روی دەرونیەوە ئاسودەین، ئەمەش بۆ هەبونی ئەو ژنانە دەگەڕێتەوە کە بەبوێری خۆیان بژێوی ژیانیان پەیدا دەکەن».

هەندێک لەو ژنانەی ئێمە دواندنمان باسلەوەدەکەن موچەکانیان بەشی پێویست نیە، بەڵام ناچارن ئەو کارە بکەن، بەوهۆیەی هیچ کەسێکیان نیە لەماڵەوە تاوەکو کاریان بۆبکات و بژێوی ژیانیان بۆ دابین بکات.

سوعاد محەمەد، ٥٩ ساڵ، کارگوزارە، بۆ (نەوژین) وتی: «هاوسەرەکەم ١٠ ساڵە مردوە، هیج مەعاشێکیم نیە، منالەکانیشم خوێندکارن و ناتوانن کاربکەن، بۆیە دەستم بەم کارە کردوە».

سوعاد، بەردەوام بو وتی: «کارەکە قورس نیە، بەڵام من کە تەمەنم بەرەو هەڵکشان ئەچێ، مانو ئەبم، بەس پێی مورتاحم چونکە بە رەنجی شانی خۆم منالەکانم بەخێو ئەکەم».

سەرباری ئەوەش، ژنانی کارگوزار باسی پیرۆزی کارەکەیان دەکەن و دەیانەوێت بەردەوام بن، چونکە بە مایەی بەردەوامی ژیانی دەزانن.

وەکو (حەلاو) کە ژنێکی تری کارگوزارە بۆ (نەوژین) دەڵێت: «کاتێک ئیشی پاککردنەوە دەکەم ئاسودەم، چونکە گەر من و ئەو و کەسێکی تر ئەم ئیشە نەکەین ناتوانین بجولێینەوە لەبەر پیسی و خاشاک».

وتیشی: «هەبونی ئەم ئیشەم گەورەترین خۆشبەختیە چونکە خۆم پێی مورتاحم سەرەڕای مانوێتیم پێیەوە».

ئازایی و بەغیرەتی بە ئیش و کارەکانی (ژیان) و هاوڕێکانیەوە دیار بو، کە بەردەوام ئەبون لە پاککردنەوەی نێو هۆڵەکانی خوێندنگەکە، بە دەم گسکلێدانەوە دەیوت: «گرنگ ئەوەیە ئەمڕۆش بەباشی ئیشەکانم بە رێکرد».

# شەیما مەحمود: شانۆ ژیانە

■ نەوژین، سەباح حسێن

**یەکێک لەو کچە شانۆکارانەی کە ئامادەییەکی بەرچاوی هەیە لەسەر سەکۆی شانۆ دا لەگەرمیان، (شەیما مەحمود جاف)ە. ئەم کچە کە خوێندکاری پەیمانگای هونەرەجوانەکانی کفرییە، لە چەندین شانۆی ناو هۆڵ و سەر شەقام دا بەشداریی کردوە، لە دواین بەشدارییشی دا لە فیستیڤاڵی شانۆی نێودەوڵەتی سەر شەقام لە بەغدا، خەڵاتی باشترین ئەکتەری کچی بەدەست هێنا.**



لەمیانەی دیدارێک دا، (شەیما) باس لەو خولیا و حەزەی دەکات کەلەو بوارەدا هەیەتی، هەروەک ئەو رێگریی و بەربەرستانەش دەخاتە رو کە پاساون بۆ ئەوەی کچان کەمتر بێنە ئەم بوارەوە.

بەگەرانەوە بۆ سەرەتاکان، ئاماژەی بەوەکرد کە پێش ئەوەی بچێتە پەیمانگا، لەرێگەی شانۆکار (عومەر عەبدوڵلا)وە، بەشداریی لە شانۆگەرییەکدا کردوە، هەر ئەو بەشدارییە خولیای شانۆی خستوەتە سەریەوەو بۆ پەرەدان بەو حەزەشی، روی لە خوێندنی ئەکادیمی کردوە لە پەیمانگای هونەرەجوانەکانی کفری.

لەبارەی ئەوەی ئەو خوێندنە لە پەیمانگا چی بۆ ئەزمونی سەربار کردوە، ئاماژەی بەوە کرد پەیمانگا هۆکارێکە بۆ ئەوەی خوێندکاران زیاتر زانیاریان هەبێت لەسەر هونەر، ئیتر چ شانۆ بێت یان موزیک و شێوەکاریی. وتیشی: «لەوێ کۆمەڵێک مامۆستا هەیە کە دەتوانن فێرخواز فێر بکەن».

لەوەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئایا پەیمانگا تاچەند رۆڵی هەیە لە دروستکردنی هونەرمەند؟ شەیما مەحمود، وتی: «ئەو حەز و خولیایەی هەتە بۆ شانۆ پەیوەندی بە پەیمانگاوە نیە، دەکرێت پەیمانگا رۆڵی هەبێت لە پەرەپێدانی تواناکانت، بەڵام ئەگەر خۆت حەز و خولیات هەبێت، ئەوا سەرکەوتو دەبیت».

لەبارەی ئەوەی شانۆ چی دەگەیەنێت بۆ (شەیما)، وتی: «ئەتوانم بڵێم شانۆ ژیانە، چونکە لەرێگەی شانۆوە هەمو ئەو ئازارانەی هەیە دەیخەیتە رو، ئیتر چ لە روی سیاسی بێت یان کۆمەڵایەتی یان دارایییەوە».

وتیشی: شانۆ باشترین ئامرازە بۆ گەیاندنی پەیام بە کەسی بەرامبەر.

بەگشتی شانۆ بەسەر دو بوارەدا بەشکراوە: تراژیدی و کۆمیدی. ئایا شەیما خۆی لەکام بوار زۆر دەبینێتەوە؟

لەوەڵامدا وتی: «هەردو شانۆی کۆمیدی و تراژیدی تەواوکەری یەکترین، بەڵام خودی خۆم زۆرتر حەزم لە شانۆی تراژیدییەو پێموایە ئەتوانم لە نواندنی تراژیدی دا سەرکەوتو بم».





لە چەند ساڵی رابردودا، شانۆی سەرشەقام لە ناوچە جیاوازەکانی هەرێمی کوردستان برەوی پەیدا کردوە، لەگەرمیانیش بەهەمانشێوە، خودی (شەیما مەحمود) لەم بوارەشدا چالاکیی هەیە.

لەوبارەوە وتی: بەشداریی چەند شانۆیەکی سەرشەقامم کردوەو شانۆی شەقام بەگرنگ دەزانم، چونکە دیواری چوارەم کەلە هۆڵدا لەنێوان بینەر و ئەکتەر دا هەیە، لەوێ نامێنێت.

وتیشی: «من خۆم بەزۆری لە فیستیڤاڵەکاندا بەشداریی شانۆی شەقام دەکەم، ئەگینا زۆرتر ئەکتەری شانۆی نێو هۆڵم».

ئاماژەی بەوەشکرد کەلە دواین فیتسیڤاڵی شانۆی شەقام لە بەغدا، توانیویەتی خەڵاتی باشترین ئەکتەری کچ بەدەستبێنێت، هەروەک لە فیستیڤاڵی نێودەوڵەتی شانۆی سەرشەقام لەکەرکوک، خەڵاتی پلەی دوەمی باشترین ئەکتەری کچی بەدەستهێناوە.

نزیکەی ٣٥ ساڵە شانۆ لەکەلار و زیاتریش لەگەرمیان بونی هەیە، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت بەشداریی ژنان تیایدا بەپێی پێویست نیە.

لەمبارەوە (شەیما) جەخت لەو رایە دەکاتەوە کەبەشداریی ژنان لە شانۆدا لەگەرمیان بەهێز نیە. وتی: «بەداخەوە لەگەرمیان هەتائێستاش بەشداریی ئافرەتان لەکاری هونەری و شانۆ رێژەیەکی بەرچاوی وەرنەگرتوە، پێموایە دەبو ئێستا لەقۆناغێکی پێشکەوتو بوایەین و رێژەمان زۆرتر بوایە، بەڵام بەداخەوە لەو ئاستەدا نیە».

لەبارەی هۆکاری ئەم حاڵەتەشەوە وتی: کۆمەڵێکی زۆر رێگری هەیە، بەڵام بە رای من دەکەوێتە سەر خودی ئافرەتەکە.

لەوبارەوە رونکردنەوەی زیاتری دا «قسەیەک هەیە دەڵێن خێزانەکان دەرفەت نادەن، من دەڵێم توانای ئافرەت زۆر لەوە زیاترە دەستی بگرێت یان رێگری لێبکرێت، بەڵکوە ئافرەت ئەگەر بیەوێت خەون و بەهرەکانی بەدی بێنێت، ئەوا هیچ شتێک نابێتە رێگر».

پێشیوایە کە ئافرەتانی خۆمان پێیان شەرمە کاری هونەریی بکەن، دەشڵێت: «ئەگەر توانای مانەوەو بەرگری کردنت هەبێت، ئەوا سەرکەوتو دەبیت».

بەڵام لەپاڵ خێزانیشدا، هەندێکی تر باس لە رێگرییەکانی ئاین دەکەن و پێیانوایە هۆکارە بۆ ئەوەی ژنان خۆیان لە قەرەی بواری هونەر نەدەن.

شەیما، پێچەوانەی ئەم بۆچونە بیردەکاتەوەو پێیوایە بۆچونێکی راست نییە و ئاین بە رێگر نازانێت.

وتی: «ئێمە زۆر خراپ لە ئاین تێگەیشتوین، ئاین نەهاتوە بڵێت تۆ نابێت شانۆ بکەیت، چونکە کە من شانۆ دەکەم واتا باسی ئازار و خەم و کۆژانی میلەت و کۆمەڵگەکەم دەکەم، کەوایا ئاین لەکوێ رێگری لەوە کردوە؟!».





# «شیننامە»



■ شیعری: ئاواز نەجم

ئەوەتەی بوم بەنەوبوکی گەڕەکێکی ئەنفالنشین،
منیش رەنگی چاوەڕوانیم گرتوە!
چاوەڕوانی .... چاوەڕوانی
وەلێ خۆشم دڵنیانیم لەوەی
چاوەڕوانی چیم
تەنها ئەوەندە ئەزانم
وەکو دارو بەرد و هەرشتێکی ئەم کۆڵانە
دەستەو نەزەری خەبەرێکم
تەنها خەبەرێک و بەس!

کۆڵان؟ نا ببورن کۆڵانی چی!
خۆ ئێرە هەر لەجێقەپۆڵگی
گۆڕهەڵکەنێکی بەعس ئەچێ و
هێشتاکە هاڵاوی گەرمییەکەی،
وەختە پشوی مەخلوقەکەی نێوی ئەبڕێ
گەرد و تۆزی بیابانەکەی عەرعەر
ئەمێستاکەش، لەئاسمانی ئەم هەوارە
غوبارێکی چڕەو بەری بە گزنگی ئومێد گرتوە!

گەڕەک: قەیرە کچێکی بێحەواسە
کراسێکی خۆڵەمێشی پۆشیوەو
دو سێ بەند موروی فرمێسک و
گەردانەی میحنەتی لەمل کردوە و
پەلکی رەش و سپی
بەدیار رۆژەکانی چاوەڕوانییەوە ئەهۆنێتەوە!
توێ توێ گوێسەبانەکانی ئێرە
بەحیکایەتی چاوەڕوانی تەیمان کراون
دارتوەکانی بەرحەوشە
ئەم ساڵ بۆ ئەوساڵ، لەبری شاتو
یەکی دو سێ هێشو مەراق ئەگرن!

ئۆهۆی خودا، ئەتۆ بڵێی
دیمەنی ئەم بستەزەمینەی ئێمە
لەهیچ سوچێکی تری مێژودا هەبوبێ!
وای چ حیکایەتێکی جەرگبڕە ئەنفال!
ئەنفال چلۆن سەربوردەیەکە؟!
خۆ هێشتاکە لەم کۆڵانەی ئێمەدا
لەئەلف و بێی هەبو نەبوەکەیدایە!

نەسرین؛ شۆڕەبییە چەمیوەکەی سەرکۆڵان
هەر لە سپێدە هەتا شێوان
تەهلیلەی ئەم قەسیدەیە ئەکات
بۆ منالانی نێو کۆڵان:

بەرەبەیان بو ئەوێ رۆژ ئەوان هاتن
خۆر تازە پەلکە زێڕینەکانی خۆی
بەسەر شان و ملی زەویدا
شۆڕەوەکردبو
دایەگەوهەر؛ کورەمەنێ چیلکەی
بەکۆڵەوە هەڵگرتبو،
تا تەندوربانەکەی پێ دەمکا!

بەهار، دەستێ جلی سوری ئاڵی پۆشیبو
شایەت ئەیویست؛ دوا نقێمی
سەر کراسە ئاڵ و والاکەی
بەهاری کوردەواری دابوکتێ!

سەردار بەدیار پەزەکانییەوە
بلوێری ژیانی لێدەداو
تاوناتاوێکیش «تەنکە گیانم تەنکە،
تەنکە رۆحی شیرینم»ێکی دەچڕی!

مام زۆرابیش دو چڵ سنەوبەری تەڕی
بەدەستەکانییەوە گرتبو،
تا لەباخچە چکۆڵەی بەرحەوشە
بینێژێ و
بە باڵایدا چارۆکەی سەوزی ئومێد
هەڵواسێ!

هەر ئەوێ رۆژ ئەوان هاتن؛
زەماوەندی مەریەمیش بو
کچ و کاڵ و پاکیزەکانی دێ
گشت لەوێ جەم بون، تا
بوخچەی بوکێنی مەریەم
لە نوقڵ و چکلێتی نزاکانیان پڕکەن!

گوند ژیانی لێدەچۆڕاو هەردەتگوت
حوجرەیەکەو لە عەدەنەکەی خواوە
بەربوەتەوە!
بەرەبەیان بو ئەوێ رۆژ ئەوان هاتن
بەرەبەیانێکی زو، بەرەبەیانێکی
پڕ لەبۆن و بەرامەی کوردەواری!

ئەوان هاتن، بەگشت کەرەستەکانی مەرگەوە
بای عەدەمیان هەڵکردبو
نەفرەت مەشخەڵی دەستیان بو
کوردبون پشکۆی نێو گوێیان بو،
سەر زاریان بو!
ئەوان هاتن، قافڵەی زیلەکانیان
لەملۆی رۆح و گیان ئاخنی
سەدای تریقەکانمانیان ئاوێتەی لم کرد
بێستانێکیان لەمەرگ و غوربەت داچاند
و
مێژومانیان لە خاچی خەتاکان دا
ئەنفال؛ باکی بە قورئانیش نەبو!

# یاسا چی دیاریکردوە بۆ ئەو ژنانەی لە مێردەکانیان جیا دەبنەوە؟

■ نەوژین، شانۆ ئیسماعیل

**رەنگە زۆربەمان ئاشنا بین بە مانای تەڵاق یان جیابونەوەی هاوسەران، بەڵام رەنگە تێگەیشتنەکەمان لەئاستێکی سەرەتایی دا بێت و ئەوەشی بیزانین زۆرتر لایەنە کۆمەڵایەتیەکەیەتی نەک یاساییەکەی، هەر ئەمەشە وادەکات زۆرجار توشی بەدحاڵی بون بێین لە بەرکەوتنمان لەگەڵ ماناکەی دا.**

لە دیدارێکی رۆژنامەی (نەوژین) دا، دڵپاک محەمەد، راوێژکاری یاسایی لە سەنتەری راوێژی خێزانیی لە گەرمیان، باسی روە یاساییەکەی تەڵاق و جیابونەوەو مەرج و بنەماکانی دەکات.

* تەڵاق چیە و ئامانج لە دانانی تەڵاق چیە؟

بەپێی یاسای باری کەسێتی و شەریعەتی ئیسلام، تەڵاق مانای هەڵگرتنی کۆتی ژن و مێردایەتیە جا دەم و دەست بڕیارەکە بدرێت یان دوای تێپەڕبونی ماوەی عیددە بێت.

بەپێی یاسا پیاو مافی تەڵاق دانی بەدەستەوەیە ئەمەش کاتێک لێهاتوی یاسایی و شەرعی هەبێت، ژنیش ئەم مافەی دەبێت ئەگەر بەو مەرجە هاوسەرگیری کردبێت کە تەڵاقی بە دەست بێت.

سەبارەت بە دانانی ئامانجی تەڵاقیش، ئاینی ئیسلام و یاساکانی هەرێمی کوردستان رێزی تەواویان بۆ مرۆڤ داناوە، بۆیە کاتێک ژن و پیاو وەک پێویست رێزی یەکتر ناگرن و هەست بە بەرپرسیارێتی یەکتر نەکەن، ئەمە وایکردوە لە شەریعەتی ئیسلام و لە یاسای باری کەسێتیش لە پێناو شکۆمەندی مرۆڤەکان رێگە بە جیابونەوە دراوە.

*بۆ کەوتنی تەڵاق ئایا لە روی یاساییەوە هیچ مەرجێک دانراوە؟

بێگومان، بۆ ئەوەی تەڵاق بکەوێت پێویستە ئەم مەرجانە هەبێت: یەکەم: کەسەکە عاقڵ بێت، چونکە عەقڵ مەرجی لێهاتوی کەسەکانە و بە عەقڵ دەزانرێت کەسەکە پەرژەوەندی خۆی دەزانێت یان نازانێت.

دوەم: پێویستە ئاگای لە خۆی بێت و هۆشیار بێت، چونکە ئەگەر ئاگای لەخۆی نەبێت و بەهۆی دەرمانێکەوە وەک بەنجی نەشتەرگەری یان خواردنەوەیەکەوە ئاگای لەخۆی نەبێت ئەوا لێرەدا تەڵاقی ناکەوێت.

سێیەم: پێویستە لەکاتی تەڵاق دا ئیرادەی هەبێت و بەویست و بڕیاری خۆی تەڵاقەکە ئەنجام بدات.

چوارەم: پێویستە لە کاتی تەڵاق دا نیەت هەبێت واتە کەسەکە بە لەفزێکی رون مەبەستی جیابونەوەبێت.

* لە روی یاساییەوە کێ تەڵاقی ناکەوێت؟

مادەی ٣٥ی یاسای باری کەسێتی ئەو کەسانەی دیاری کردوە کەوا تەڵاقیان ناکەوێت، کە ئەمانەن:

یەکەم: تەڵاقی سەرخۆش. زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی تەڵاقی کەسێک ناکەوێت کە بە خواردن و خواردنەوەیەک بێئاگا بوبێت یان بێهۆشیەکەی بەهۆی زۆر لێکردن یان ناچارییەوە بێت.

دوەم: تەڵاقی شێت و گێل. بەهەمان شێوەی یەکەم زانایان یەک دەنگن لەسەرئەوەی تەڵاقی شێت ناکەوێت، بەڵام شێتیەکەی پچڕ پچڕ نەبێت.

بەهەمان شێوەی شێت، (گێل) یش تەڵاقی ناکەوێت.

گێل بەکەسێک ئەوترێت باش و خراپی خۆی لەیەک جیا ناکاتەوە بۆیە ئەم کەسەش هەمان حوکمی شێت وەرئەگرێت لە روی یاساییەوە.

* یاسا چی لەبارەی ئەو کەسانەوە دەڵێت کە لەکاتی تورەیی دا بڕیاری تەڵاق دەدەن؟

زۆربەی زانایانی شەریعەت کە بنەمای یاساکانیشە، پێیانوایە تەڵاقی تورە ناکەوێت، واتا کەسەکە هێندە تورە بێت کە کۆنترۆڵی خۆی لەدەست بدات. جا بۆ ئەوەی ئەم حاڵەتە بێتە دی یاسای باری کەسێتی مەرجی داناوە دەبێت کەسی تورە تەمیزی لەدەست دابێت وەک ئەوەی کە کەوتبێتە بارودۆخێکی وەهاوە کە نەزانێت چی دەکات، زۆرجار ئەم حاڵەتە لە ئەنجامی تەمەن زۆریەوە ئەبێت و کۆمەڵێک قسەو کرداری پڕوپوچ ئەکات کە وا هیچ بناغەیەکی نیە و هەربۆیەش تەڵاقەکەی ناکەوێت، بۆ پیاوی گەنجیش کە تورە ببێت بەجۆرێک تورەییەکەی گەیشتبێتە ئاستێک وەک شێتی لێهاتبێت و باش و خراپی خۆی لەو دەمە لەبیر کردبێت و دوای هاتنەوە باری ئاسایی خۆی بکەوێتەوە بیری یان بیخەنەوە بیری کە تەڵاقی خواردوە لەم کاتەدا هەڵبەتە حوکمی ئەو پیاوەش ئەچێتەوە چوارچێوەی هەمان ئەو کەسەی کە پیرە.

*لەئێستادا زۆرن ئەو پیاوانەی کەوا بێ ئاگاداری ژنەکەی، ژنەکەی تەڵاق ئەدات، ئایا مافی ئەم ژنە لە روی یاساوە چیە؟

کاتێک پیاو بێ ئاگاداری ژنەکەی ژنەکە تەڵاق ئەدات کەواتە زوڵمی لە ژنەکەی کردوە، چونکە وەک ئەسڵ هەرپیاوێک بیەوێت ژنەکەی تەڵاق بدات دەبێت لە دادگای (أحوال شخصي) داوا تۆمار بکات، کە دەیەوێت ژنەکەی تەڵاق بدات، کاتێکیش کە ئەم پیاوە داوای تەڵاقدان تۆمار دەکات مولزەم دەکرێت بە دانانی مەبلەغێک پارە بۆ ماوەی سێ مانگ لە سندوقی تایبەت بە چاودێری خێزان لە دادگا دادەنرێت.

وەک وتمان لەم حاڵەتەدا ژنەکە زوڵمی لێ کراوە بۆیە پێویستە بۆ دادگاش بسەلمێت کەوا پیاوەکە ستەمی لە ژنەکەی کردوە و بەوهۆیەوە ژنەکە توشی زیان هاتوە، هەڵبەتە پیاوەکە تەڵاقەکەی کەوتوە بۆیە دادگاش داوا دەکات لە پیاوەکە قەرەبویەک بە ژنەکە بدات لەگەڵ بارودۆخی دارایی و ئاستی ستەمەکەی بگونجێت.

* ئەو قەرەبویانە چین؟

ئەم قەرەبویە بۆماوەیەکی دیاری کراو دەبێت کە لە سێ ساڵ کەمتر نەبێت و لە پێنج ساڵیش زیاتر نەبێت، واتە جگە لە نەفەقە ژنەکە ئەم قەرەبوەشی بۆ دەستەبەر دەکرێت.

هەروەک ژنە تەڵاقدراوەکە کۆمەڵێک مافی تریشی هەیە، وەک: مافی مارەیی، مافی بژێوی، بەتایبەتی ئەگەر هاتو منداڵی هەبو لەبەرامبەر بەخێوکردنی منداڵەکان پیاوەکە دەبێت «نفقە»ی پێ بدات.

هەروەها ئافرەتەکە مافی نیشتەجێبونی هەیە لەو خانوەی کە پیاوەکە خاوەنیەتی، ژنەکە بۆ ماوەی سێ ساڵ دەتوانێت لەو خانوەدا بمێنێتەوە بێ بەرامبەر، بەڵام بەمەرجێک پیاوەکە بەبێ هیچ عوزرێکی شەرعی و یاسایی ژنەکەی تەڵاق دابێت.

هەروەک ئافرەتەکە دوای ماوەی عدەی، دەتوانێت هاوسەرگیری دیکە بکاتەوە.

---

# چیرۆکی ئەو ژنانەی پرچیان لەچاوەڕوانی هاوسەرەکانیان دا سپی کرد



■ نەوژین، دیمەن ئیسماعیل

**ئەگەر شەڕی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێران هەزاران پیاوی کردبێتە قوربانی، ئەوا لەپاڵیشیدا سەدان ژنی لە دودڵی و چارەنوسێکی مۆلەق دا بەجێهێشت، بەتایبەتی کە هاوسەرەکانیان تائێستا مانەوەیان لە ژیان رون نەبوەتەوە.**

شەڕی ئێران و عێراق، ئەو شەڕە بو کە لە ئەیلولی ١٩٨٠ دەستی پێکرد و لە ئابی ١٩٨٨ بۆ ماوەی ٨ ساڵ درێژەی کێشا، تیایدا بەهەزاران مرۆڤ لەهەردو لا بونە قوربانی و خەزێنەی ئابوری هەردو وڵاتیشی لە مایەپوچبون نزیک کردەوە.

بەشێکی تر لە قوربانیەکانی ئەم شەڕە، وەک هەمیشە ژنان بون، کەبە قوربانیە بێدەنگەکانی شەڕ ناسراون، ئەویش کاتێک سەدان ژن هاوسەرەکانیان لەم شەڕانەدا چارەنوسییان بە هەڵواسراویی مایەوەو یەکلا نەبویەوە و بەکەسانی شوێنبزر «مفقود» ناسراون.

ئەو ژنانە باسلەوەدەکەن، لەچاوەڕوانی یەکلایی بونەوەی چارەنوسی هاوسەرەکانیان، پرچی رەشیان سپی کردوەتەوە.

بەهیە، ٥٨ ساڵ، ژنێکە کە هاوسەرەکەی لە شەڕەکەدا شوێنبزر بوەو چارەنوسی نەزانراوە. بۆ (نەوژین) وتی: «هاوسەرەکەم لەو شەڕە دا ون بوە، دوای ٢١ ساڵ لە لایەن حکومەتەوە بەڵگەنامەی مردنی بۆ دەرکرا».

بە خەمباریەوە وتیشی: «کۆتا جار مێردەکەم رۆشتەوە بۆ شەڕ دڵم باش لێی نەدا پێم وت مەڕۆ، بڕۆی ناگەڕێتەوە، بەڵام ئەو وتی تەنیا ئەمجارە دەڕۆم، رۆشت بەڵام نەگەڕایەوە».

رەنگە (بەهیە) بەختی باش بوبێت کە دۆسیەی چارەنوسی مێردەکەی یەکلا کراوەتەوە، چونکە زۆرێکی تر لە ژنان تائێستا بە مان یان نەمان، وەڵامێکیان لەبارەی چارەنوسی هاوسەرەکانیانەوە پێنەگەیشتوە.

شەوکەت محەمەد، ٥٥ ساڵ، ژنێکی دانیشتوی قەزای کەلارە، کە هاوسەرەکەی لەشەڕەکەدا شوێنبزر بوە، وتی: «مێردەکەم ماوەی ٣٦ ساڵە لە شەڕی ئێران و عێراق چارەنوسی نادیارە، حکومەتی هەرێم لە دۆزینەوەی بێئومێدی کردوین، بەڵام تائێستاش هەر چاوەڕوانم».

بەشێک لە ژنان، پاش ئەوەی بێئومێد بون لە گەڕانەوەی هاوسەرەکانیان یان بە فەرمی بە مردو هەژمار کراون، هاوسەرگیرییان کردوەتەوە.

شەوکەت، لەوبارەوە وتی: «کۆمەڵگا رێگر نیە لەوەی هاوسەرگیری بکەمەوە، بەڵکو بەهۆی خۆشویستنی مێردەکەمەوەیە کە ناتوانم بڕیاری هاوسەرگیری بدەمەوە».

ئەوەی وایکردوە چاوەڕوانی ژنانی مێرد شوێنبزر نەبێتە کارێکی بێهودە، ئەوەیە کە ژمارەیەک لەو پیاوانە پاش ساڵانێک گەڕاونەتەوە.

گوڵباخ حەسەن، ژنێکی دانیشتوی شاری کەلارە و یەکێکە لەو ئافرەتانەی کە هاوسەرەکەی پاش دیارنەمانی لە شەڕەکە گەڕایەوە.

ئەو لە لێدوانی دا بۆ (نەوژین)، ئاماژەی بەوەکرد «بە ئومێدێکی زۆرەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەی هاوسەرەکەم بوم، خۆشبەختانە دوای ٩ ساڵ لە چاوەڕوانی گەڕایەوە».

لەنێوان کێشمەکێشی ئەوەی چارەنوسی ئەو پیاوانە چین و یاسا چۆن لێی دەڕوانێت، پارێزەرێک رونکردنەوەی یاسایی دەدات.

سەباح مەحمود، بۆ (نەوژین) وتی: «بەپێی مادەی ٩٣ لە یاسای چاودێری ناکامەکان دەڵێت: دو جۆر ون بون هەیە، ون بونی کەسەکە لە بارودۆخی ئاسایی ئافرەتەکە تاکو ٤ ساڵ چاوەڕوانی دەبێت، بەڵام ون بونی کەسەکە لە کاتی شەڕدا بۆ ماوەی ٢ ساڵ چاوەڕوانی دەبێت دواتر دەتوانێت هاوسەرگیری بکاتەوە».

ئەو پارێزەرە رونکردنەوەی زیاتری دا وتی: ئەم ئافرەتانە بڕیاری هاوسەرگیری بدەنەوە باشترە، چونکە ئەو پیاوانە ئەگەر مابن تا ئێستا دەگەڕانەوە.

بەڵام وادیارە ئەم بڕگانە بەنیسبەت زۆرێک لەو ژنانەوە، تەنها دەقێکی نوسراوی بێگیانن، چونکە ئەوان سەرباری هەمو پشتگیرییەکی یاسایی و بێئومێدییەکی سیاسیی، ئامادەنین دەستبەرداری خەونی هاتنەوەی هاوسەرەکانیان بن.

شەوکەت، لەوبارەوە وتی: «تا مردن چاوەڕوانی هاوسەرەکەم دەبم بگەڕێتەوە».



# خەونە وەریوەکانی دوای «تەخەروج»



■ ژینۆ عەلی

**لەم رۆژانەی رابردودا، ئاهەنگی دەرچون «تخرج»م لە پەیمانگا هاورێ لەگەڵ هاوپەیمانگاکانم دا گێڕا کە ژمارەیان سەدان بون، بەدوای ئەوەدا حاڵ و بارێکی سەیر باڵی بەسەردا کێشام، لەدڵی خۆمدا وتم: ئەوە ١٤ ساڵ خوێندن و رەنج دان، دوای ئەمە چی؟!**

ئـەم پرسـیارە روبـەڕوی هەمومـان دەبێتـەوە بەبێ جیاوازیـی رەگەزی، بـەڵام رەنگە بۆ ئێمەی کچـان زیاتر. ئێمە کە دەردەچین، زۆرترین ئومێدمان هەیـە و کەمتریـن چانـس، پڕین لە ئاواتی جۆراوجۆر، بەڵام کە بەر هەوای گەرمی واقیع دەکەوین، وەکو کلوە بەفر لە پەشـمەکەوە دەگۆڕێـن بۆ چەند دڵۆپەیەک ئاو.

ئێمە دەردەچین و گەورەترین سەرسوڕمان کەبەرۆکمان دەگرێت ئەوەیە: لەکوێین؟ گەیشتوینەتە کام وێستگەی ژیان؟ ئەی دوای ئـەم هەمو رەنج و تێکۆشـان و خەرجییە، چارەنوسـمان چی دەبێت؟ هەمدیس کونجی ماڵەوە؟

خەونی زۆرینـەی رەهای ئێمەی کچان خوێندنـە، بـە مەرامی ئـەوەی ئەم خوێندنە، بمانگەیەنێت بە چارەنوسێکی باشـتر و بە قۆناغێک بتوانین کەمێک لە ئـاوات و خولیاکانمان بەدیی بێنین، چیتر نەبینە بار بەسەر کەسەوە.

لەم پێناوەشـدا هەندێک لەکچان دوای تەواوکردنـی خوێنـدن و تەخـەروج کردنیـان توانیویانە جێگـەی خۆیان بکەنـەوە لە کەرتی تایبەت دا و کارێک بکەن، تا بتوانن ئەو بار و قورسـاییەی کە لەکاتی خوێندن دا لەسەر ماڵەوەیان هەبوە لـەدوای خوێندنیش بەردەوامیی پێنەدەن، ئەمەش بەشێکی دیاریکراوی کچان دەگرێتەوە، بەشە زۆرەکەی کچان بێکارن و دانەمەزراون و ناتوانن ژیانێکی ئاسایی و گوزەرانێکی باش بکەن.

لەمـاوەی خوێندن دا کچـان دەتوانن بە پاسـاوی خوێندنەوە، خێزانەکانیان خەرجیەکانیان لە ئەسـتۆ بگرن، بەڵام دوای تەواوکردنـی خوێنـدن ناتوانن و هیچ هۆکارێک نیە تا بتوانن هەرکاتێک بیانەوێـت داوای پـارە یـان هــەر داواکارییەکی تر لەماڵەوە بکەن.

هەمـو تاکێـک، دوای دەرچونـی، ٢ کەرتی لەبەردەمە بۆ کار: کەرتی گشتی (حکومـەت) و کەرتی تایبەت (بازاڕ)، بـەڵام بـۆ کچانی کەرتی سـێیەمیش سەربار دەبێت: بێکاریی (ماڵەوە).

لەئێسـتادا دەرفەتـی دامەزرانـدن لە کەرتی گشتی زۆر ئاستەمە، بەتایبەتی ئـەو کەرتە خـۆی قەیرانـی هەیە و توشی هەڵئاوسـانێکی خنکێنەر بوە، لەبەرامبەریشدا بەتایبەت بۆ ناوچەیەکی وەکـو گەرمیان، خەمەکـە ئەوەیە کە کەرتی تایبەتیشمان نییە و لاوازە.

کچان کە لە زانکۆ و پەیمانگا دەردەچن، لە کام سلک و بواری کەرتی تایبەت کار بکەن؟ کام کارگە و کام کۆمپانیا و کام مۆڵ و کام سەنتەر و کام و کام ...؟!

من هەرگیز نامەوێت تا دوا سات گەشبینی لەدەست بدەم، بەڵام دەپرسم: کچێک کە دوای ١٤ یان ١٦ سـاڵ خوێندن، خۆی لەبارێکـدا دەبینێتەوە کـە رەنجەکەی وەکو ئەوەی فەرهادی لێهاتوە، دەبێت چ گەشبینییەک لەخۆیدا بدۆزێتەوە؟

ئەو کە نە بتوانێت لە بواری پسپۆڕیەکەی خۆیدا کارێک بـکات کە هەم ئەزمونی زیاتـر بکات و هەم خەرجیشـی دابین بکات، دەبێت چی بکات و هەڵوێسـتی چۆن بێت؟

لەم سـاڵانەدا کەرتی تایبـەت تۆزێک جـوڵاوە، بـەڵام کێشـەکە ئەوەیە کە سروشـتی هەندێک خێزان وایە رێگە بە کچەکەی نـادات لە کەرتێکی تایبەت و لـە رێکخراوی تایبـەت دا ئیش بکات، لـەوەش گەورەتر ئەوەیە ئەم کەرتەش بێسەروبەر و رێکنەخراوە.

لـەم بێسەروبەریەشـدا، حکومـەت بەرپرسـیاری یەکەمـە، چونکـە ئەو وەکچۆن بەرپرسـە لـەوەی نەوەکانی خوێندەوار بن، ئاواش بەرپرسە لەوەی ژیان و نان و کەرامەتیان بۆ دابین بکات.

ژیان و نـان و کەرامەتیش، بریتییە لە خوڵقانـدن و پێدانی دەرفەتی کار، بۆ ئەوەی مرۆڤ بەشـێوە سروشـتیی و ئاساییەکەی خۆی، بەبێ ئەوەی هەست بکات بارە بەسـەر کەسی دیکەوە، کار بـکات و بژێویـی ژیانی خـۆی دابین بکات.

ئـەم کارەش بۆ حکومەتێک کە چوەتە نـاو ورد و درشـتی سـێکتەرەکانی ژیانی خەڵکەکەیـەوە، کارێکی مەحاڵ نییە، بەڵکو ئەوەی پێویسـتە کەمێک خەمخۆریـی و پلانـە، ئەگەرنا ئەوا بۆ سـاڵانی داهاتـو، خۆمـان لەبەردەم لەشکرێک لە کچان و کوڕانی ناڕازیی و بێدەرەتانـی دەرچوی زانکۆ و پەیمانگا دەبینینەوە. لەشکرێک کە ئەندامەکانی ١٤ بۆ ١٦ سـاڵ بە وەهمـی ژیانێکی باشـتر دەخرێنە بەر خوێندن، کەچی لەو سەرەوە ئەوەی دەیچننەوە بێکاریی و نائومێدیە!

# کاندیدکردنی ژنان لەنێوان عەقڵیەتی خێڵ و ژمارەدا



> حزبەکان دروستکراوی عەقڵیەتی خێڵ و هەڵگری ناوی دیموکراسین

■ پەیمان ئەمین

**لەدێر زەمانەوە ژنان هەوڵی ئەوەیانداوە بونی خۆیان بسەلمێنن و زۆر بوار و رێگەیان تاقیکردوەتەوە و پێی گەیشتون، ئەگەر سەرکەوتوش نەبوبن شکستەکانیان بەهۆکاری جیاواز هاتوەتە پێش لە شکستی پیاوان گەورەتر نەبوە.**

ئێستا و لە رۆژگاری ئەمڕۆ دا قۆناغێکی تر لـە بزوتنـەوەی ژنـان بەڕێوەیە، بەجۆرێـک لـە سەرتاسـەری جیهاندا ژنان هەوڵ بۆ بەدەسـتهێنانی پۆستە گرنگەکانـی بەڕێوەبردنـی وڵات و کۆنگرێس و پەرلەمان دەدەن، بەجۆرێک لە هەڵبژاردنـی داهاتـوی پەرلەمانی عێراقدا کاندیدکردنی ژنان لەلایەن حزبە راستڕەو و چەپڕەوەکانەوە وەکو گرەوی سیاسیی لێهاتوە و زیاتر باسوخواسەکان لەسـەر کاندیدکردنـی ژنـان گەرمە، بەجۆرێک هەندێک لەم ژنانە کەوتونەتە بەر ناوزڕاندن و خزێنراونەتەوە ناو گەمە سیاسـی و ململانێ ناشـەریفانەکانی هەڵبژاردنەوە کە لە بنەڕەتدا دەبێت ژنان بۆ داکۆکیکردن لە مافەکانیان و پرسە گرنگەکانی بواری ژنان تێبکۆشن.

بەڵام یەکەم تیری ئاراسـتەکراو بەهۆی نەبونی پارێزبەندی کەسێتی ژنەوە بەر ئـەو کاندیدە ژنانە کـەوت کە دواجار ئەمە تـرس و چاوشـکاندنە بۆ هاتنە پێشـەوەی ئەو ژنانەی کە دەیانەوێت لەبوارە جیاوازەکاندا دەرکەون و هزری کۆمەڵگـە گۆڕانکاریـی بەسـەردابێت سەبارەت بەتواناکانی ژنان.

ئەگەرچی لە ئێستادا ١٤٦ کاندیدی ژن بەتەنها لەهەرێمی کوردستانەوە کێبڕکێ لەسـەر بەدەسـتهێنانی کورسییەکانی پەرلەمانـی عێراق دەکـەن کە دەکاتە رێـژەی ٣ ,٢٩٪ ی کاندیدکراوەکانـی هەرێـم، ئەمە بەراورد بـە قۆناغەکانی رابردو گەشەی بەرچاوی هەبوە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ خولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان لەکۆی ١١١ کورسی پەرلەمان تەنها ٨ کورسییان لەدەستی ژناندا بوە، بـەڵام بەپێی برگەی چوارەم لە مادەی ٤٩ی دەسـتوری عێراق و مادەی ١١ ی ژمارە ١٦ ی ساڵی ٢٠٠٥ ی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق رێژەی ٢٥٪ دانراوە بۆ کۆتای ژنان لە ئەنجومەنەکە بەجۆرێکە لـەدوای هـەر دو کورسـی پیاوێـک کورسییەک بەر ژنێک دەکەوێت.

ئـەم بەشـداریکردنەی ژنـان لـە مومارەسـەکردنی مافـە سیاسـی و مەدەنییەکانـی وەکـو دەنگـدان و خۆپاڵاوتن و کارکـردن لە ئەنجومەنی خۆجێییەکان و پەرلەمان و ئەنجومەنی وەزیران لە ئاست چاوەڕوانی ژناندا نییە بەراورد بە وڵاتانی پێشکەوتو چونکە لە کۆمەڵگەیەکی وەکو کوردستان حزبەکان دروستکراوی عەقڵییەتی خێڵ و هەڵگری ناوی دیموکراسـی و جێبەجێکاری ئەو عەقڵییەتەن کە کاری لەسـەر دەکەن هێشتا لەمپەرە لەبەردەم بەدیارخستنی تواناکانی ژنان و هاتنەپێشەوەیان، هەر ئەمـەش وایکردوە ژنـەکان ئەجێندای حزبەکان جێبەجێبکەن کەخودی حزب بەشـێکە بۆ تێکشـکاندنی ئەجێندای ژنان تا لەسەرەتای بانگەشەکاندا ژنان روبـەڕوی پلانی مەترسـیدار دەبنەوە لەناوزڕاندن و لەکەدارکردنیان چ لەبواری کەسـێتی یـان شـکاندنیان لەلایەن میدیاکانەوە یان لەلایەن خودی حزبەوە کە پێموایـە کاندیدکردنی ژنان لەلایەن حزبەکانەوە بەدەر لە روی یاساییەکەی تەنها بۆ ئەوەیە وای نیشـانبدەن بوار بەدەرکەوتنی ژنـان دەدەن، بەڵام ئەم بوارپێدانـە ئەوەندەی لە روکاردا دیارە لەناوەڕۆکدا ئـەو ژنانە لەبڕیاری دژ بە ژنانـدا دەنگیان پێدراوە و نەیانتوانیوە لـەو فۆرمە کۆمەڵایەتییـە لابدەن، کە دەسـەڵاتی بەڕێوەبـردن رابەرایەتـی دەکات و ژن بەپلە دو تەماشا دەکات.

# کرانەوەی گرێی بەختی ژنان!

■ ناز عەلی

**لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق دا بە هەزاران کاندیدای ژن لە نەتەوەو پێکهاتەو حزب و قەوارەو لیستە جیاجیاکان بونیان هەیە، لەنێویشیاندا بە دەیان کاندیدای ژن هەیە بەو ئومێدەی بتوانن نمایندەی خواست و داواکاری ژنان بن لە پارلەمان.**

لەو کاتـەوەی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانـی عێراق دەکرێت، بەگشـتی لەسەر ئاستی عێراق، ژنان زۆر بەکەمی توانیویانە دەنگی پێویسـت بۆ بون بە ئاندامێتـی پارلەمان بەدەسـت بێنن، بەڵکو بەزۆری لەرێگەی «کۆتا»وە بون بە پارلەمانتار.

کۆتـا، بریتیە لەو رێژەیە کورسـیەی کەلە پارلەماندا بـۆ ژنان دادەنرێت کە لە پارلەمانی عێراق ٢٥٪ی کورسیەکان دەدرێت بە ژنان، بەمپێیەش دەبێت بە لای کەمەوە ٩٦ ژن لەم هەڵبژاردنە براوە بن و بچنە نێو هۆڵی ئەنجومەنەوە.

زۆربـەی ژنانی کاندیدای کوردسـتان، ئەوانەی دەرچون و بونەتە پارلەمانتار، لەرێگـەی کۆتـاوە دەنگیـان هێناوە، ئەمـەش لەکاتێکدا کارێکی یاسـایی و ئاسایە، بەڵام هاوکات مایەی هەڵوەستە لەسەر کردنیشە.

چونکە ئەگـەر زۆر نەڵێین ئەوا بەلای کەمـەوە ژنان نیـوەی دەنگدەران یان شتێک کەمتری نیوەی دەنگدەران دەبن بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی هیچ ئامارێکی فەرمیم دەسـتنەکەوت باس لەم خاڵە بـکات، کەواتـا ئەگەر نیـوەی ژنان دەنگدەرن، بۆچی روبعێکیان ئەویش بە کۆتاوە دەبنە پارلەمانتار؟

مـن نامەوێت مرۆڤ لەسـەر ئاسـتی رەگەزی هەڵبسـەنگێنم، واتا پێموابێت ژنێکی کـەم ئەزمون مـەدام ژنە ئەوا باشـترە لەپیاوێکی بە ئەزمون، بەڵام ئەگـەر دیقـەت بدەین ئـەوا دەبینین جیاوازیەکانـی نێـوان کاندیداکانی ژن و پیاو لە بەرنامەو ئاسـتی خوێندن و پلەی زانسـتی و ئاسـتی رۆشنبیریی، زۆریان جیاواز نییە.

بەمانـای ئـەوەی کە چـۆن کاندیدای پیاوی بڕوانامەدار و پسپۆڕ و شارەزامان هەیە، ئەواش ژنی بڕوانامەدار و پسپۆڕ و شارەزامان هەیە، کەوایە بۆچی هەمو دەنگـەکان بـۆ پیاوان بچـن تەنانەت دەنگی دەنگدەرانی ژنیش؟

من بـڕوام وایـە ئەمـەش پەیوەندی بە گرێیەکـی دەرونیەوە هەیـە لەناو تاکەکانی کۆمەڵـگای کوەردەواری دا. جگە لەوەی دەرفەتی ئیش و سیاسەت لە کوردەواری دا زیاتر بە پیاوان دراوەو ئەوان رۆڵیان زیاتر و زۆرتر بوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گرێیەکی دەرونی لەناو ناخـی تاکەکان بە تایبـەت ژنان هەیە بەرامبەر بە لایەنی رەگەزی.

ژنان تائێسـتا خۆیان هاوشانی پیاوان نازانن و بە پلەیـەک خۆیان کەمتر لە پیـاوان دەبینن ئەگەر نەڵێین بە چەند پلەیـەک. ئەم تێروانینـە وایکردوە کە ژنان متمانەیـان بەخۆیان لاواز بێت و پێیانوابێـت کە ئـەوان کەمتر دەتوانن داکۆکی بکەن و ئەو شـەڕە پارلەمانیە بکەن کە لە پارلەماندا پیاوان دەیکەن.

بەداخـەوە زۆرێکمـان وا لەپارلەمـان تێگەیشتوین کە شوێنی قاڵەقاڵ و شەڕ و دەنـگ بەرزکردنەوەیـە، کە ئەمەش وایکـردوە پێمانوابێت پیاوان زۆرتر بۆ ئەمە دەست دەدەن وەک لە ژنان، هەر ئەمەشـە وادەکات کاندیداکانـی ژنان کەمتر متمانە بەدەست بێنن.

سـەرباری تێبینیـەکان، بـەڵام پارلەمانتارانی ژن لە ماوەکانی رابردودا تاڕادەیـەک سـەرکەوتو بون و ئیش و ئیلتیزامی خۆیان کـردوە، ئیتر ئەگەر زۆر باشـیش نەبوبن، ئەوا لانی کەم لە پیـاوان خراپتر نەبون، کەچی کە دێتە سەر متمانە بەخشین، زۆرتر پیاوانمان لەپێشچاوەو کەمتر ژنان.

> کاتی ئەوە هاتوە ژنان پێداچونەوەیەک بە بیرکردنەوەیاندا بکەن

بۆیـە کاتـی ئـەوە هاتـوە ژنـان پێداچونەوەیـەک بـە بیرکردنەوەیاندا بکەن، هەڵبژاردنەکان بکەن بە دەروازەو دەرفەتێـک بۆ ئەوەی خۆیان لەو گرێی خۆ بەکـەم زانیـن و بـێ متمانەییە رزگار بکەن و هەوڵبـدەن فراوانتر بیر بکەنەوە.

# ئایا شیری قوتو دەبێتە شوێنگرەوەی شیری دایک؟

## دیدار لەگەڵ پزیشکێکی پسپۆڕی منالان



■ نەوژین، سوزان خەلیل

**پێدانی شیری قوتو و پێنەدانی شیری دایک، یەکێکە لە سیما و حاڵەتە دیارەکانی ئێستا، بەشێوەیەک کە کەم دایک هەیە بۆ شیرپێدانی منالەکەی، پشت بە شیری قوتو نەبەستێت، پزیشکێکیش هۆشداریی دەدات لەم حاڵەتە.**

لە پێشودا، بەکارهێنانی شیری قوتو لەلایەن دایکانەوە، حاڵەتێکی دەگمەن و ئاوارتە بو، بەڵام ئێستا پێچەوانە بوەتەوە، زۆرێک لە دایکان یان حەوسەڵەی پێدانی شیریان نیە بە منالەکانیان، یان بەو پاساوەی شیریان کەمە، خۆیان دەبوێرن لەو کارە.

روخۆش عومەر، ژنێکی دانیشتوی شاری کەلارە، تەنها ٣ مانگ شیری خۆی بە کۆرپەکەی داوەو دواتر لێی بڕیوەتەوە.

لەبارەی هۆکاری ئەم هەنگاوە، وتی: من ماوەی ٣ مانگ شیری خۆمم دا بە منالەکەم، بەڵام دوای ئەوە هەستم کرد کە شیرم کەم بوەتەوە، بۆیە بە ناچاری شیری قوتوم بەکارهێنا.

سەرباری کەمبونەوەی رێژەی شیر لەلای هەندێک لەدایکان، هەندێکی دیکەیان نەخۆشکەوتن بەهۆکاری ئەوە دەزانن کە پەنایان بۆ شیری قوتو بردوە.

شادان محەمەد، کوڕەکەی تەمەنی ساڵ و نیوێکە، لەو ١٨ مانگەدا، تەنها ٢ مانگ شیری خۆی پێداوە.

لەوبارەوە وتی: «من ماوەی ٢ مانگ شیری خۆمم بە منالەکەم دا، بەڵام لەبەر ئەوەی شوێنی نەشتەرگەریەکەم هەوی کردبو، بۆیە منیش دەرزیم بەکارهێنا، هەر لەبەر ئەوەش شیرم نەما و بۆیە بەناچاری شیری قوتوم بە منالەکەم دا».

بەڵام ئەوەی کە ژنان شیری خۆیان نادەن بە منالەکانیان و هەر پشت بە شیری قوتو دەبەستن، حاڵەتێکی کۆتایی و بڕاوە نییە، چونکە تائێستا دایکانێک هەن کە جگە لە شیری خۆیان، ئامادە نین شیری قوتو بە منالەکانیان بدەن.

دایکی ئەیوب، منالە تەمەن ٩ مانگەکەی لەباوەش دابو، بە باوەڕبەخۆبونێکەوە وتی: «من تاوەکو ئێستا شیری خۆمی پێ دەدەم، چونکە شیری دایک بەسودە بۆ منالەکەم و جارێ ئامادە نیم شیری قوتوی پێبدەم».

ئەم کارەی (دایکی ئەیوب)، لەلایەن پزیشکێکەوە مایەی دەستخۆشییە و بە کارێکی راست و گونجاوی دەزانێت.

د. سۆران ئەحمەد محەمەد، پزیشکی پسپۆری نەخۆشیەکانی منالان، بە (نەوژین)ی وت: «شیری دایک سودەکانی زۆرن، لەوانە بڕێکی زۆر لە دژە تەنەکانی تێدایە کە پێویستن بۆ بەرگری لەشی منال، بەردەوام ئامادەیە لە پلەی گەرمی گونجاو کە سوکە بۆ کرداری هەرسکردن بە بەراورد بە شیری قوتو کە خوێیەکانی قورسن لە سەر ریخۆڵە و گورچیلە».

شیری دایک بڕێکی زۆر لە دژەتەنەکان و ئەنزیمەکان و هۆرمۆنەکان و دژە ڤایرۆس و بەکتریاکانی تێدایە کە زۆر پێویستن بۆ بەرگری و گەشەی منال، بەڵام زۆرێک لە دایکان بەهۆی ئەوەی شیریان کەمە، ناتوانن بۆ منالەکانیان فەراهەمی بکەن.

لەبارەی ئەوەی دایکان چۆن شیریان زیاد بکەن، د.سۆران، ئاماژەی بەوە کرد: «دایکان بەخواردنی هەندێک خواردنی وەکو: (برنج، هێلکە، سپێناخ، گوێز، گێزەر، مۆز، شلک، سەوزە و میوەکان) لەگەڵ ئاو خواردنەوەیەکی باشدا، وادەکات رێژەی شیریان زیاد بکات».

لەوەڵامی پرسیاری ئەوەی ئەگەر دایکان هەر سور بون لەسەر پێدانی شیری قوتو بە منالەکانیان، ئەوا دەبێت رەچاوی چ خاڵێک بکەن؟

ئەو پزیشکە پسپۆڕەی منالان، وتی: «زۆر گرنگە شیردان بە شێوەیەکی خاوێن بێت، واتە شوشەی شیرەکان جوان پاکبکرێنەوە دوای هەمو شیردانێک، بەجۆرێک لە ئاوی گەرم تا ئەندازەی کوڵان دابنرێن دواتر بۆ ماوەی ٥ خولەک بە فڵچە بشۆردرێت، ئەگەر تا ٢٤ کاتژمێر بەکار نەهێنرا پێویستە دوبارە مەمەشوشەکە بە باشیی و جوانی بشۆردرێتەوە».

وتیشی: «بەشێوەیەکی گشتی شیردان زۆر پێویستە تا تەمەنی ٢ ساڵ، دواتر دەبێت بە کوپ پێیان بدرێت و کەمبکرێتەوە، بە جۆرێک هەر خواردنێک گەورە بیخوات ئەوانیش ئەتوانن بیخۆن، ئەوەش گرنگە شیرپێدانەکە بهێڵدرێتەوە بۆ کۆتایی».

---

# سوڕی مانگانە و مەترسیی دروستبونی نەخۆشیی شیرپەنجە

■ نەوژین

**هەندێک لە ژنان ترسیان لەوە هەیە کە سوڕی مانگانەیان سەر بکێشێت بۆ توشبون بە نەخۆشی خراپتر کە دیارترینیان شیرپەنجەیە، بەڵام ئایا ئەم ترسە تاچەند راستە؟ تاچەند بون و بنەمای هەیە؟**

لەمیانەی دیدارێکی گۆڤاری (لەها)، پزیشکیی تایبەتمەند بە نەخۆشیەکانی ژنان، (رەفقا ئەبو حەبیب)، وەڵامی ئەو ترس و نیگەرانی و رارایيانە دەداتەوە.

* دیارترین ئەو نەخۆشیانەی کەلەناو ژناندا زۆر بەربڵاون چین؟

بەربڵاوترین جۆرەکانی نەخۆشی لەناو ژنان، هەوکردنی منالدان و دەردانی رێرەوی منالدانە، ئەمەش لەژنێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوڕێت.

* ئەی لەکاتی سوڕی مانگانەدا، ژنان هەندێکجار هەست بە ناڕەحەتی دەکەن و مەترسیی نەخۆشیی تر دەکەن، ئەو حاڵەتە چییە؟

هەندێکجار ژنان لەکاتی سوڕی مانگانەدا روبەڕوی جۆرێک لە تێکچونی جەستەیی دەبنەوە، ئەمیش چ لەروی درەنگ کەوتن یان زو کەوتنی سوڕەکە، یاخود زۆری بڕی ئەو خوێنەی ژنان دایدەنەن لەو سوڕەدا، یان ئەو کاریگەرییە لاوەکیانەی کەدروستی دەکات وەک دەرچونی زیپکەو تەنانەت دروستبونی ئازاری زۆریش. ئەمانەش رەنگە پەیوەندیان بە کیس دروستبون هەبێت لەمنالدان دا، بەگشتی چارەسەریان هەیەو بەراوێژ و سەردانی پزیشک و پشکنین و سۆنار دەستنیشان دەکرێن و چارەسەر دەکرێن.

هەرچی ئازاریشە، ئەوا لەرێگەی هەندێک دەرمانەوە دەتوانرێت کەمبکرێتەوەو چارەسەر بکرێت، هەندێکجار پێویست دەکات بۆ رێکخستنی سوڕەکەو کەمکردنەوەی ئازارەکان، پزیشک دەرزی بەکاربێنێت، بەگشتی ئەم حاڵەتانەش دەبێت پزیشک دەستنیشانی بکات و بۆتی چارەسەر بکات نەک لەخۆتەوە دەست بە خواردن و بەکارهێنانی داودەرمان بکەیت.

* پاکوخاوێن راگرتنی خۆت تاچەند رۆڵی هەیە لە کەمبونەوەی کێشەکانی پەیوەندیدار بە سوڕی مانگانەو منالدان؟

بەڵێ زۆر سودی دەبێت، چونکە بەپاکوخاوێن راگرتنی خۆت، ئەوا خۆت دەپارێزیت لە روبەڕوبونەوەی مەترسیی توشبون بە نەخۆشی دیکەو هەوکردن، هەروەک پاکوخاوێنی وادەکات سوڕەکە بە کەمترین ئازار و زیان تەواو بێت و رۆڵیشی دەبێت لەکەمبونەوەی ئازارە جەستەییەکان دا.

* بونی ئەم کێشانە لە سوڕی مانگانە، تاچەند مەترسیی توشبونی ژنانی لێدەکەوێتە بە نەخۆشی شیرپەنجە؟ چونکە ترسێکی وا لەلای ژنان بونی هەیە کە ئەو حاڵەتانە سەر بکێشێت بۆ شیرپەنجە؟

بەنیسبەت شیرپەنجەوە، ئەوا لەناو ژناندا دیارترین جۆری شیرپەنجە، هی مەمکە، ئەویش لەرێگەی پشکنینی ماموگرافییەوە هەر لەسەرەتاوە دەتوانرێت دەستنیشان بکرێت و بەگرتنەبەری هەنگاوی پزیشکیی، دەتوانرێت چارەسەر بکرێت.

بەڵام ئەو شیرپەنجەیەی پەیوەندیی بە منالدانەوە هەبێت، چەند جۆرێکن کە مەترسیدارترینیان ئەوەیە کە توشی ناوپۆش «بطانە» منالدان دەبێت، بەدوای ئەویشدا شیرپەنجەی ملی منالدان و پاشان هێلکەدان دێت.

* هۆکاری توشبون بەم جۆرە شیرپەنجانە لە رەحم و منالداندا چییە؟




بەگشتی هۆکارەکانی رون و دیارییکراو نین، رەنگە پەیوەندیی بە لایەنی بۆماوەیی هەبێت، واتا بە ویراسی لە خێزانەوە بەجێ مابێت، یاخود رەنگە پەیوەندی بە خواردنی جۆرێک ژەهرەوە هەبێت لە خواردنەکاندا.

*کەواتا باشترین رێنمایی چییە بۆ دوربون لەمجۆرە نەخۆشیانەی کە ئاماژەت پێدا؟

باشترین رێنمایی ئەوەیە خۆیان بپارێزن، خۆپاراستن بەوەی کە خۆیان بە پاکی رابگرن و گرنگیی بە پاکو خاوێنی بەشی کۆئەندامی زاوزێیان بدەن، هەروەک لەکاتی بونی هەر کێشەیەکدا ئەگەر بچوکیش بێت، ئەوا سەردانی پزیشک بکەن، چونکە سەردانی پزیشک هەر تەنها بۆ ژنان نیە کە شویان کردبێت یاخود دوگیان بن، بەڵکو هەمو کچ و ژنێک لەهەر تەمەنێکدا بێت واباشە ناوەناو و لەکاتی بونی کێشەو ئاڵۆزییەک لە بەشی کۆئەندامی زاوزێی دا، سەردانی پزیشک بکات.

هەروەها خاڵێکی تر زۆرگرنگە کە کچان هەر لەمنالیەوە رابهێنرێن بە گرنگیدان بە تەندروستیی خۆیان و پاکوخاوێنی، هەروەها ئاشناکردنیان بەو گۆڕانکارییە جەستەییەی کە لەگەڵ گەورەبونیاندا رودەدات و بۆیان شیی بکرێتەوە کە ئەو گۆڕانکارییانە چین و دەبێت چۆن مامەڵەی لەگەڵ بکەن، بۆ ئەمەش دەبێت دایکان بەتایبەت ئەو رۆڵە هۆشیارییە بۆ کچەکانیان بگێڕن.



# چۆن لە وەرزی هاویندا روخسارێکی سەرنجڕاکێشمان هەبێت؟

■ نەوژین، سێوە محەمەد

**تا ئێستا بیرت کردوەتەوە چۆن لەوەرزی گەرمادا جوان و سەرنجڕاکێش پێش چاو بکەویت و توشی توانەوەی ماکیاژ نەبیت؟**

وەرزی گەرما وادەکات کەرەستەکانی ماکیاژ کردن بۆماوەیەکی درێژ بەرگری لەمانەوەیان نەکەن لەسەر پێست، لەگەڵ ئەوەشدا دیمەنێکی ناشیرین بە پێست دەدات. بۆ ئەم مەبەستە شارەزایانی جوانکاری چەند هونەرێک ئاشکرا دەکەن لەکاتی ماکیاژ کردندا، بۆ ئەوەی پێست بە درێژی رۆژ ماکیاژەکەی لەسەر بمێنێتەوە بێ ئەوەی تێک بچێت و ناشیرین بێت.

**١. بەکارهێنانی کرێمی دژە خۆر**

وا باشترە دژە خۆرەکان لەو جۆرانەبێت کە هیچ جۆرە چەوریەکی تێدا نییە، بەم شێوەیە زیاتر پارێزگاری لە مانەوەی ماکیاژەکە دەکات لەسەر پێست.

**٢. کەرەستەی جوانکاری دژە ئاو:**

زۆر گرنگە لەم وەرزەدا ئەو کەرەستە جوانکاریانە بەکاربهێنن کە لە جۆری دژە ئاون، بەهۆی ئەوەی زیاتر بەرگەی شێداری و ئارەقەی پێست دەگرن، بەتایبەت کەرەستەکانی وەک: ماسکارا و کلی چاو و رمێل، چونکە ئەم کەرەستانە بچوکترین شێداری یان ئارەقەکردنەوە دەبێتە هۆی جیابونەوەیان لە چاو یان هاتنەخوارەوەیان.

هەروەها گەرمای هاوین هۆکاری توانەوەی سوراوی لێویشە، بۆیە پێش سوراو کردن ٣٠ چرکە لە کاتی خۆت تەرخان بکە بۆ تەختیتی لێوت بە قەڵەمی لێو، ئەمە چارەسەرە بۆ مانەوەی سوراو لەسەر لێو لەوەرزی گەرمادا.

> گەرما وادەکات کەرەستەکانی ماکیاژ بۆ ماوەیەکی درێژ نەمێننەوە

**٣. پارچەیەک سەهۆڵ**

ساردیی سەهۆڵ یارمەتی مانەوەی ماکیاژ دەدات لەسەر پێستی روخسار و رێگری لەهاتنە دەرەوەی چەوری زیادە دەکەن بۆ سەر پێست، بۆ ئەم مەبەستە چەند پارچە سەهۆڵێک بکەنە سەر پارچە قوماشێکی سپی تەنک، بیخەنە سەر پێستی روخسارتان بۆ ماوەی چەند خولەکێک بیهێڵنەوە، دواتر ماکیاژەکە ئەنجام بدەن.

**٤. ئارایشتی سادە**

لە وەرزی گەرمادا هەوڵبدە کەم ئارایشت بکەیت، واتا ئارایشتی سادە. هەوڵبدە زیاتر سود لە سپیاوی پاودەر وەربگیرێت باشترە وەک لە فاوندەیشن (Fond de tein) بۆ راکێشانی چەوری سەر پێست، بۆ پۆشینی پەڵەی دەموچاو پەنا بۆ فاوندەیشن مەبە لە هاوین دا زیاتر کۆنسیلەر بەکار بێنە.

**٥. واز لە سەر رومەت بێنە**

لە وەرزی گەرمادا کەمتر سەر رومەت بەکاربێنە، چونکە گەرما هۆکاری کۆبونەوەی خوێنە لەسەر رومەتەکان، بۆیە پێویست ناکات ئەوەندە سەر رومەت و هایلایت بەکار بێنیت.



# قەدەم خێر

■ نەوژین، شاران بەرزنجی

**لە مێژوی کوردا زۆر سەرکردەی ناسراو و بەناوبانگ هەن، بەڵام کەمیان ژن بون، هەروەک زۆر ژنی ناسراو و بەناوبانگیشمان هەبون، بەڵام کەمیان سەرکردەی سەربازیی بون.**

> قەدەم خێر، یەکێکە لە ژنە ناودارەکانی ناوچەی لوڕستان

> قەدەم خێر پێنج ساڵ قارەمانانە دژی سوپاکەی شا جەنگی کرد

قەدەم خێر، یەکێکە لە ژنە ناسراو و سەرکردە بەناوبانگ و ناسراوەکانی مێژوی دێرینی کورد. ئەو بێ لە پێگە کۆمەڵایەتیەکەی، یەکێکە لە ژنە ناودارەکانی ناوچەی لوڕستان، ڕابەرایەتی شۆڕشی پشتکۆی کرد.

ئەو خاوەنی سوپایەکی گەورە و پڕ چەک بوە، هەروەک چۆن خۆی خاوەنی بیرو باوەڕی پاک و بێگەرد بو، کۆششی کردوە لەپێناوی ئازادی و سەربەستی نەتەوەی کورد دا، لەمپێناوەشدا خۆی و خێزانەکەی قوربانیی زۆریان داوە.

رەزا شا، توانی بەفرِ و فێڵ (شا موراد خان)ی برای شەهید بکات، شەهیدبونی براکەی هانی دا ئەو بێتە مەیدانەکەوەو زیاتر بلێسە بە شۆڕش و خەبات و تۆڵەسەندن لەدوژمن بدات، هەربۆیە رابەرایەتی شۆڕشی دژ بە داگیرکەرانی وڵاتی کرد.

لەنامەیەکیدا بۆ شێخ مەحمودی نەمر، (قەدەم خێر) داوای کردوە کە پێکەوە هێز و توانایان یەکبخەن و پەلاماری هێزی دوژمن بدەن، دوای ئەوە سوپای شا زۆر درندانە پەلاماری ناوچەی پشتکۆی دا و دەستیانکرد بەکوشتن و برین و تاڵانکردن.

ئامانجی لەمکارەش ئەوەبوە کەبەیەکەوە کورد هەمو دژی داگیرکەران بوەستنەوەو بەگژیاندا بچنەوە.

قەدەم خێر، پێنج ساڵ قارەمانانە دژی سوپاکەی شا جەنگی کرد، کاتێک دوژمنان زانیان شەڕ لەگەڵیان دا سودی نییە، بیریان لەفێڵ و پیلان کردەوەو توانیان دوبەرەکی بخەنە ناو خێڵەکانی ئەو ناوچەیە، لەئەنجامی خیانەتکردن و بەڵێنپێدان بە لێبوردنی گشتی، توانیان شۆڕشەکە سەرکوت بکەن.

رەزا شا لە نامەکەیدا بۆ (قەدەم خێر) قورئانێکی نارد تا باشتر بڕوا بەو لێبوردنە بکەن کە بۆی دەرکردون، تەنانەت نەک هەر سەر لەشکرەکانی قەدەم خێر باوەڕیان پێکرد، بەڵکو قەدەم خێر خۆیشی باوەڕی بە رەزا شا کرد و خۆیان دا بەدەستەوە.

بەڵام وەکو هەمو داگیرکارێکی تری خیانەتکار و بێبەزەیی و بەڵێن، رەزا شا حەڤدە کەسی لە بەرپرسەکانی ئەو شۆڕشە لەسێدارەدا و (قەدەم خێر)یشی زیندان کرد.

سەرچاوەکان باسلەوەدەکەن (قەدەم خێر) دوا رۆژەکانی ژیانی لە زیندان دا بەسەر بردوە.

## دەربارەی نەوژین

نەوژین، رۆژنامەیەکی سەربەخۆی تایبەتمەندە بە پرسەکانی ژنان، مانگانە لەلایەن رادیۆی دەنگ لە گەرمیان بڵاودەکرێتەوە.

یەکەم ژمارەی لە ٢٠١٦/١٢/٢٦ دەرچوە.

رادیۆی دەنگ، پرۆژەیەکی میدیایی سەربەخۆیە لە ناوچەی گەرمیان، لە (٢٠١٠)ەوە بە پەخشی رادیۆیەکی لۆکاڵی دەستی پێکردوەو پاشان وێبسایتێکی داناوە.

رۆژنامەی (نەوژین) یەکێکە لە چالاکیەکانی پرۆژەی رادیۆی دەنگ بە پاڵپشتی سندوقی نیشتمانی بۆ دیموکراسی (NED) ئەمریکی.

رۆژنامەی نەوژین یەکێکە لە چالاکیەکانی پرۆژەیەکی رادیۆی دەنگ کە لەلایەن سندوقەکەوە پاڵپشتیی دەکرێت.

رۆژنامەنوسانی ئەم رۆژنامەیە، ژمارەیەک کچن کەپێشتر خولێکی راهێنانیان لەلایەن رادیۆی دەنگەوە بۆئەنجامدراوەو زۆرینەیان پێشتر کاری رۆژنامەوانییان نەکردوە.

بۆ پەیوەندیکردن بە رۆژنامەکەوە

تەلەفۆن:
٠٧٤٨٠٢٠٧٤٠٠

ئیمەیڵ:
nawzhinnewspaper@gmail.com

فەیسبوک:
nawzhinnewspaper

دەتوانن لەماڵپەڕی رادیۆی دەنگ کۆپی ئیلیکترۆنی ژمارەکانی رۆژنامەکە ببینن

www.radiodang.org

# 9 ساڵ لەخەمی پاراستنی سەگ و پشیلە دا

▪ نەوژین، دلێر عەبدولڕەحمان

**ئافرەتێک ماوەی ٩ ساڵە لە خەمی پاراستنی سەگ و پشیلەدایە و دەڵێت: هەر ئاژەڵێک پێویستی بە هاوکاری ئێمە بێت چارەسەری دەکەین، بەڵام لە وڵاتی ئێمەدا زیاتر سەگ ئازار دەدرێت بۆیە منیش زیاتر لەخەمی ئەو ئاژەڵەدام.**

لەکۆمەڵگەی ئێمـــەدا، راگرتنی ئاژەڵ بەجۆرە جیاوازەکانیەوە رەگێکی دوری هەیە، بەڵام ئەوەی ئەم ئافرەتە دەیکات شتێکی جیاوازە، چونکە کارەکەی زۆرتر ماکێکـــی مرۆییانەی هەیەو مەبەســـتی لێی، پاراستنی ئەو ئاژەڵانەیە.

فریشـــتە نەجات، ٣٧ ساڵ، دانیشتوی شاری ســـلێمانیە، لەبارەی بایەخدانی بـــە پاراســـتنی ئـــاژەڵان بەگشـــتی و ســـەگ بەتایبەتی بۆ (نەوژین)ی وت: «خزمەتکـــردن و بایەخدان بە ســـەگ لای من حەز نییـــە، بەڵکو بیرکردنەوە و تێگەیشـــتن و هەســـتکردنمە بـــەو ئاژەڵە کـــە بەبەردەوامی ئازار دەدرێت لەلایەن هاوڵاتیان بەگشتی و منالانەوە بەتایبەتی».

هەروەها وتی: «نزیکەی ٨- ٩ ســـاڵە بەبەردەوامـــی خـــۆم تەرخـــان کردوە بۆ پاراســـتن و خزمەتکردنی ســـەگ و لەوکارەشـــمدا هاوســـەرەکەم هاوکاریم دەکات».

ژمارەیەکـــی بەرچاو لە ژنـــان هەن کە لە بـــوارە جیاوازەکانـــی کاری مرۆیی بەتایبەتی ژینگەیی دا کاردەکەن، بەڵام رەنگە ئەم بـــواری پاراســـتنی ئاژەڵە کەمتـــر چالاکوانان خۆیانـــی لە قەرە بدەن.

فریشـــتە کە مامۆســـتایە، لەپاڵ ئیشە فەرمیەکەی خـــۆی و کاروباری خێزانی دا، بەشێکی زۆری کاتی رۆژانەی خۆی، بۆ پاراستنی ئاژەڵەکان تەرخانکردوە.

ئامـــاژەی بەوەکـــرد «هـــەر ئاژەڵێکی دیکەش پێویستی بەهاوکاری بێت ئێمە چارەسەری دەکەین و هیچ ئاژەڵێکمان فەرامۆش نەکردوە، بەڵام لەوڵاتی ئێمەدا بەپلەی یەک ســـەگ ئازار دەدرێت بۆیە منیش زیاتر بایەخم بەو ئاژەڵەداوە».

فریشتە لەبارەی چارەنوسی ئەوسەگانەی خزمەتیان دەکات، رونیکردەوە «هەندێک لەو ســـەگانە دوای چارەسەر دراون بە خەڵکانی ئاژەڵدۆســـت و هەندێکیشیان لای خۆمانن و بەبەردەوامیش ســـەگ و پشیلە لەدەوروبەری ماڵەکەماندا بونیان هەیە».

ئامـــاژەی بەوەشـــدا «زۆرینـــەی ئەو سەگ و پشـــیلانەی خزمەتمان کردون پێویســـتیان بەچارەســـەری پزیشکی هەبوە و هەندێکیان نەشتەرگەرییان بۆ کراوە».

بەگشتی تێڕوانینی کۆمەڵگا بۆ راگرتنی ئاژەڵی وەکو سەگ و پشیلە، لەئاستێکی نزمدایـــە و بەکارێکی ناپەســـەند وێنا دەکرێت.

لەبـــارەی ئـــەوەی کۆمەڵـــگا چی بەو دەڵێت، (فریشتە نەجات) نایشارێتەوە کە «هەندێک خەڵک بەکارێکی باشـــی دەزانـــن و دەستخۆشـــیمان لێدەکەن، بەپێچەوانەشـــەوە هەندێکی تر بەباشی نازانێت».

ئاشکراشـــیکرد «لەســـەر ئـــەم بایەخدانەمان بە پاراســـتنی ئاژەڵان تا ئێستا لەلایەن هیچ لایەن و رێکخراوێکی مەدەنی و حکومییەوە هیچ دەستخۆشی و پێزانینێکمان لێنەکراوە».







# کەلار پڕ بوە لە هۆڵی وەرزشیی ژنان



▪ نەوژین، هاوژین مەهدی

**ئەگەرچی پێش چەند ساڵێک دەرگاکانی هۆڵی لەشجوانی بەڕوی ئافرەتانی کەلار دا داخرابون، بەڵام ئێستا رەوشەکە بەشێوەیەک پێچەوانە بوەتەوە کە کەم گەڕەک هەیەو هۆڵێک یان زیاتری بۆ وەرزش و لەشڕێکی ژنان لەخۆنەگرێت.**

هۆڵەکانی لەشجوانی و راهێنانی وەرزشی بـــۆ ژنان، لە قەزای کەلار و هەندێک لە ناحیەکانی دەوروبەریشدا، بەشێوەیەکی بەرچـــاو پەرەیان ســـەندوەو رویان لە زیادبون کردوە، راهێنەرەکانی هۆڵەکان باس لە زۆریی خواســـتی ژنان لەســـەر هۆڵەکانیـــان دەکەن، لەبەرامبەریشـــدا ژنانیش باســـلەوەدەکەن وەرزش کردن سودی زۆری پێگەیاندون.

ئاڵا حەسەن، ژنێکی دانیشتوی گەڕەکی کەلاری کۆنە، زۆربەی رۆژەکانی هەفتە ســـەردانی هۆڵی راهێنانی وەرزشـــیی گەڕەکەکەیـــان دەکات. بـــۆ (نەوژین) وتـــی: «راهێنانەکان زۆر باشـــن و زۆر سودم لێوەرگرتوە و بۆتە قوتابخانەیەک بۆمـــان، هەفتانەیش دو جـــار دەڕۆینە دەرەوەی هۆڵەکـــە بـــۆ وەرزش و راهێنان».

ئەو ژنە ئاماژەی بەوەکرد کە بەشێوەیەک راهاتوە لەسەر وەرزشکردن، کە ئەگەر رۆژێک نەچێت هەســـت بـــە کفتبونی جەستەو ناڕەحەتی دەرون دەکات.

ئەم هەستە لەلای (ئەسمەر حەمید)یش بونی هەیە. ئەو کە بەهەمانشـــێوە ژنی ماڵەوەیە، بەڵام لە گەڕەکی فەرمانبەران نیشـــتەجێیەو رۆژانە لە هۆڵی وەرزشی گەڕەکەکەیان راهێنان دەکات.

وتـــی: «مـــن بـــۆ دابەزاندنـــی کێش هاتومەتە ئەم هۆڵە و زۆریش دابەزیوم، ســـێ مانگ ئەبێت هاتومەتە ئێرەو ١٠ کیلۆ دابەزیوم».

وتیشی: «هەرچەند پێشتر نەم دەزانی شـــوێنی وا هەیە، بەڵام ئێســـتا رۆژێک نەیەمـــە هۆڵەکە زۆر بێتاقـــەت ئەبم، چونکە راهاتوم».

لەپێشوتر دا ژمارەی هۆڵەکانی وەرزشی ژنان زۆر کەم و دیارییکراو بون، ئەمەش وایدەکـــرد کە ژنان بەشـــی پێویســـت دەرفەتیـــان نەبێـــت راهێنـــان بکەن، بەتایبەت ئـــەو ژنانەی کە فەرمانبەرن، بەڵام لەگـــەڵ کردنەوەی هۆڵی راهێنان لەگەڕەکەکان، رەوشەکە گۆڕاوە.

نـــازدار جەبار، فەرمانبـــەر، یەکێکە لە ئافرەتانـــی هۆڵی لەشـــجوانی کەلاری کـــۆن، دەڵێت: «پێشـــتر نەمدەتوانی سەردانی هۆڵەکانی تر بکەم لەبەر ئیش و منداڵ، بەڵام ئێســـتا زۆر دڵخۆشم کە لە گەڕەکەکەمان ئەم هۆڵە کراوەتەوە و بەشداریم تێدا کردوە».

وتیشـــی: لەو کاتەوەی سەردانی ئێرەم کـــردوە ١٥ کیلـــۆ کێشـــم دابەزیوە و کاریگەری نەخۆشـــی فشاری خوێنیشم کەمتر بوەتەوە.

هۆڵە وەرزشیەکان، بەزۆری دابەشکراون بەسەر ٢ کاتدا، هەر کاتەو بۆ رەگەزێک تەرخانکـــراوە، کە کاتـــی ژنان بەزۆری دەکەوێتە بەیانیانەوە.

راهێنـــەری هۆڵەکان، باســـلەوەدەکەن خواست لەســـەر هۆڵەکانیان رۆژ دوای رۆژ زیاتر بـــوە، ئەمەش دەگێڕنەوە بۆ ئەو سودە تەندروستیانەی کە ژنان لەو وەرزشکردنانەدا دەیبینن.

بەهار رەحیم، راهێنەری هۆڵی وەرزشی گەڕەکـــی کـــەلاری کـــۆن، دەڵێـــت: «بەزۆری ئافرەتان بۆ دابەزاندنی کێش و چارەسەری سروشتی بۆ رزگاربونیان لە قەڵەویی ســـەردانی هۆڵەکەدەکەن و سودی باشیان بینیوە».

باسیلەوەشـــکرد کە هەمو ئافرەتەکان بەرنامەی تایبەتی وەرزشکردنی خۆیان هەیـــە «تەمەنەکان جیـــا کراونەتەوە لەگەڵ ئاستەکاندا».

ســـازگار عەبدولڕەحمـــان، راهێنـــەری هۆڵی وەرزشـــی گەڕەکی فەرمانبەران، بـــۆ (نەوژین) وتی: «ســـاڵ و نیوێکە ئەم هۆڵە کراوەتەوە، سەرەتا ئافرەتان کەمتر بەشـــداریان دەکرد، بەڵام ئێستا بەشـــێوەیەکی زۆر بـــاش بەشـــداری دەکەن».

ئـــەو راهێنـــەرە ئاماژەی بەوەشـــکرد کە بەپێـــی وەرزەکان بەشـــداریکردنی ئافرەتانیـــش دەگۆڕێت، بەشـــێوەیەک لـــەو وەرزانەی دەوامکردنـــی فەرمانگە و قوتابخانەکانـــی تێـــدا کەمتـــر بێت، ئافرەتـــان زیاتـــر ســـەردانی هۆڵەکان دەکەن.

جگە لە یاریی و راهێنانی نێو هۆڵەکان، هەندێـــک لە هۆڵەکان ژنانـــی راهێنراو دەبەنە مەلەوانگەو دەرەوەی هۆڵیش بۆ ئەنجامدانی راهێنانی دیکەی وەرزشی.

خێـــڵان رەشـــید، راهێنـــەری هۆڵـــی ئۆڵۆمپـــی کین ســـپۆرت، لەوبارەوە بۆ (نەوژیـــن) وتی: «بۆ ئەوەی ســـودی زۆرتـــر ببینن، ئەوا جگە لەراهێنانی ناو هۆڵەکان، زۆرجاریش ئافرەتانی راهێنراو دەبەینە دەرەوەی هـــۆڵ بەتایبەتی بۆ مەلەوانی».